# مناجات

حەمدێ بێ حەد بۆ خودایێ عالەمین
ئەو خودایێ دایە مە دینێ موبین

ئەم کرینە ئوممەتا خەیرولبەشەر
تابعێ وی موقتەدایێ نامەوەر

ئەو خودایێ مالکێ مولکێ عەزیم
دایە مە میراس قورئانا کەریم

دینێ مە کر کامیل و نیێعمەت تەمام
یەعنی دامە ئەحمەد و داروسسەلام

ئەو خودایێ بێ نەزیر و زولجەلال
بێ مسال وبێ هەڤال و بێ زەوال

رازقێ بێ دەست وپا و ماروموور
عالمێ سڕانە گۆتی، دەرسودوور

کارسازێ بەندە و سولتانێ جان
راحم و رەحمان لەتیف و میێهرەبان

ئاسمانێ بێ سوتوون وی کر پەدید
سوورەتێ باخال و خەت وی ئافەرید

هیڤیدارین ئەم ژتە شاهێ کەریم
" اهدنا یارب صراط المستقیم"

ئێ ژمە سووج و خەتاتێن وستەم
لێ ژتە ئێحسان وغوفران و کەرەم

یاڕەب ئیمانێ دخازن ئەم مودام
ژێر ئالایا موحەممەد وەسسەلام

فەقیهی باتەیی

# نێوه‌رۆک

**وێنه‌ی پشت جلد**

**خه‌رمان هه‌ڵاویشتن**

**...وێنه‌ی روو جلد**

**...کوڵه‌به‌رۆژه،**
**...اسڵێکی گرینگی**
**کوردستان**

## سه‌روتار

له درێژه‌ی زنجیره باسی عیلم وزانست له ژماره‌ی پێشوودا له‌سه‌ر ده‌وری سه‌یرو سه‌مه‌ره ودوولایه‌نه‌ی زانست له هه‌ڵلا و بگری قووڵ و دنیاداگردا قسه‌مان به‌م پرسیاره براوه که باوه‌کوو ئاڵ وگۆڕێکی زۆر گرینگ و هه‌مه لایه‌نه له بیر و رای سیاسی و کۆمه‌ڵایه‌تی خه‌ڵکدا پێک هاتووه و راده‌ی فه‌رهه‌نگی ئه‌وان له رابردوو له‌سه‌ره‌وه‌تره ئه‌دی چۆنه حاکمی زاڵم‌وچه‌وسێنه‌رو تاغووتی له گۆڕه‌پانی* جیهاندا له‌سه‌ر چاره‌نووسی گه‌لان حاکمه‌تی ده‌که‌ن؟

به‌رله‌وه‌ڵام دانه‌وه ده‌بێ ئه‌وه بڵێین که که‌وشه‌ن و چوارچێوه‌ی ده‌سته‌ڵاتی چه‌وسێنه - رانی ئیمڕۆ له‌گه‌ڵ پێشینانی ئه‌وان جیاوازی سه‌ره‌کی هه‌یه وشی کردنه‌وه‌ی ته‌فاوه‌تی چه‌ندوچۆن ورواڵه‌ت و ده‌روونی ئه‌وان باسان

بۆخۆی زنجیرەباسێکی گرینگ و بەرچاوە وخوا یاربێ لە ژمارەکانی داهاتوودا باسی لێوە دەکەین باثەوەشمان لەبیر نەچێ کەخۆسەپاندنی ڕیزی چەوسێنەر لە دونیای ئیمرۆدا وەک قەدیم بە هێرشی نیزامی دەست پێ ناکا ، چون هەل و مەرجی سیاسی وکۆمەلایەتی وپێوەندی خەلک لەگەل یەکدی وتەنەوەی دەنگ وباس لە لایەک و خەرج وموخاریجی هات وچۆو گواستنەوەی هێزی نیزامی لە لایەکی دیکەوە ئەم کارەی زۆر دژوارو ئەستەم کردووە وهێرش کەر پاش تاقی کردنەوەی هەموو فێل و پیلانێک وەک ئاخرین ڕێگا چارە هێرشی نیزامی دەکار دێنێ .

خۆسەپاندنی چەوسێنەرانی جیهانی ئیمرۆ بە هێرشی ئابووری وفەرهەنگی ودەست بەسەر ئەوانە داگرتن دەست پێدەکا ولە دوایدا هێزی سیاسی ونیزامی دێتە پال ئیستیعماری ئەم عەسرە وەک قەدیم بڕوای بەکەلک وەرگرتن لەهێزو توانستی نیزامی نیە بەلکوو بەجێی ئەم کارە تێدەکۆشێ بە هێرشی بەرفرەی* فەرهەنگی و ئابووری جێ بۆ دەستەلات و پەلاماری نیزامی خۆش بکا وشێوازی نیزامی ئەم چەشنە ولاتە کەمتوانستانە بۆ پاراستنی قازانجی کۆلەداران بێ وبەس .

بەلام ماکەی وتاری ئێمە ئەوەیە کە ملهوڕی جیهانی لە ئیستیعماری تازەی خۆیدا بۆکەلک وەرگرتنی هەرا و لەزانست وتیکنۆلۆژی پێشکەوتوو ،هەرگیزنەیدەتوانی ئاوا سەرکەوێ و تا ئەو رادەیە لە دنیای سێهەمدا نفووز بکا و بە سەر شارەگی ئابووری وسیاسی ونیزامی ئەواندا هێندە زال بێ.

زانستگە بەناوبانگ وموعتە - بەرەکانی جیهان،ئاکادێمی و ناوەندە زانستی یەکان شەریکە وسازمانە گەورەکان کە لەسەر پرۆژەی زانستی کار دەکەن وهەموو ئەم چەشنە ناوەندانە لەژێر دەسەلاتی ملهوڕانی جیهاندا هەلدەسووڕێن.ئەم لێکۆلینەوە هەراوانە وپرۆژە زانستی یانە وا بەڕێوە دەچن کە پێش هەموو شتێک گیرفانی ئەو دنیاخۆرانە باخنێ . دوائین کەشف وڕووداوەکانی زانستی وەک ڕازێکی سەربە مۆر دەمێنێتەوە. ئەگەر کەشفێکی تازە بکرێ لە پێشدا سازمانە ترسناکە ئەمنی یەکان ( پارێزەری سوودی سەرمایەداران)ئاگادار دەکرێن وهەتا سەرمایەدارە- کان وملهوڕەکان سوودی لێ وەرنەگرن بلاو ناکرێنەوە پاشان لە پێوانەیەکی کەمدا ئەو شتەتازە تەولید دەکەن و تەبلیغاتێکی هەراوی بۆ دەکەن و لە لایەن خەلکی تامەزرۆوی ، جیهانەوە سفارشی زۆریان پێدەگا . جا ئەوجار تەولید دەکەوێتە پێوانەیەکی هەراوی* بەربلاو. بەمجۆرە سوودێکی لەژمار نەهاتوو وەدەست ئیستیکباری جیهانی دەکەوێ و لەباری زانست و ئابووریشەوە خۆیان دەخزێننە ناو تان وپۆی ولاتە دواکەوتووەکان . لێرەدا بە فرۆشتنی فۆرمولە نهێنی یەکان پوولێ زۆر و زەوەند وسەروەتی زۆر گەورە لەباری نیزامی وسیاسی یەوە وەردەگرن .

بەهرە گرتنی ملهوڕی جیهانی لە زانست تەنیا لەو چوارچێوەدا کەباسمان کرد نامێنێتەوە. زۆربەی پرۆژەزانستی،سەنعەتی یەکان لەسەر پێشنیاری سازمانە ئەمنی یەکان وئەوناوەندانەی کە بە سەرمایەدارەکانەوە بەستراونەوە دادەڕێژرێن و

جێ بەجێ دەکرێن . کێ دەتوانێ ئەم راستویە حاشا بکا کە بەرهەمی لێکۆڵینەوەی زانستی و سەنعەتی لە خزمەت تەولیدی چەک وچۆڵی نیزامی دایە؟ بەڵێ ئەمڕۆ زۆرترین لێکۆڵینەوەی زانستی و سەنعەتی بۆ بردنە سەری پلەی چۆنەتی چەک وچۆڵی نیزامی و هەروەها پتەو کردنی هێزی سەرکوت کردن و وێرانکاری و ترساندن و هەڕەشە وجاسووسی تەرخان کراوە.

فڕۆکە شەڕکەرەکان، بۆم هاوێژەکان ،فڕۆکەجاسووسی - یەکان ،مووشەکەدوور زەنەکان بۆمی کیمیاوی ومیکرۆبی نەخۆشی ایدز ( چەکی میکرۆبی پنتاگۆن) و .... هەمووی بەرهەمی لێکۆڵینەوەی زانستی زانایانی بەناوبانگی جیهانن کە راستەوخۆ یا ناڕاستەوخۆ لە خزمەت ئیستیکباری جیهانی وجەماوەری سەرمایە دارانی جیهانی دان.هێرشی فەرهەنگی دوژمنانی بەرەی مرۆڤ بەکەڵک وەرگرتن لە تێکنولۆژی پێوەندی سیستیمی دەنگ ورەنگ وهەزار فێڵ و پیلانی دیکە توانیویانە هەویەی فەرهەنگی ژمارێکی زۆر لە گەلانی جیهان بگۆڕن.و فەرهەنگی لە "خۆبێگانەبوون" و" خۆ دۆڕاندن"و"بێز لەخۆکردن دەرخواردی ئەوان بدەن.

لەمەڕ کامپیۆتەریشەوە کە ئەمڕۆکە گەورەترین بەرهەمی تێکنۆلۆژی تازەیە و لە هەموو شوێنێکی ژیاندا کەڵکی لێ وەردەگیرێ ئەو بارودۆخەی باسمان کرد بەردەوامە. زۆر بە داخ وکەسەرەوە دەبێ بڵێین کە ئەم ئامرازە بەکەڵکە زۆرتر بۆ ئامانجی پیس و چەپەڵ کەڵکی لێ وەردەگیرێ تاخزمەت بە ئادەمیزاد .

ئەمڕۆ کارتێل و تراستە گەورەکان کەشارەگی ئابووری دنیای سێهەمیان بەدەستەوەیە زیاتر لە هەموو ناوەندورێکخراوەیەک لە کامپیۆتەر کەڵک وەردەگرن. ئەو خەتەی کە پێشکەوتووترین چەکی ماڵ وێرانکەری تێدا تەولید دەکرێ وسەیرو سەمەرەترین سیستیمی جاسووسی تێدا هەڵدەسورێندرێ زیاتر لە هەموو خەتێکی دیکە لە کامپیوتەر کەڵک وەردەگرێ.

کامپیوتەری ئەوڕۆ یار و یارمەتی دەری سازمانە جاسووسی یە نەترە*بەرەکانن و لەشەڕی ڕەوانی وجاسووسی و دۆزینەوەی ئەسراری دیزە بە دەرخۆنەکراودا ، یارمەتی ئەوان دەدەن.

ئەگەر لەسەر ئەو باسە بڕۆین دەبێ وەخت و " زەمانێکی زۆری بۆ تەرخان کەین. لەگەڵ ئامانج و ئارمانی داهێنەری ئەوباسە یەک ناگرێتەوە. چونکە ئەو نەقڵە دوور و درێژە و بەو زوانە کۆتایی نایە

ئێستا پرسیاری گرینگ ئەوەیە. لە هەل ومەرجی ئاوادا ئەرکی ئێمە چیە ؟ چ ڕێگەیەک دەگرینە بەر ؟ ڕێگەی پاراستنی مەکتەبی مرۆڤایەتی وفەرهەنگی سەر بەخۆ لەم جیهانە ئاڵۆز و تێک هاڵاوەدا چیە ؟

در شماره پیش در ادامه سلسله بحثهای مربوط به علم‌ودانش ودر مقام تشریح نقش عجیب ودوگانه علم در غوغای عمیق وفراگیر جهان سخن بدین سوال ختم شد که آیا باتوجه به همه تغییراتی که در افکار و اندیشه‌های سیاسی،اجتماعی و سطح فرهنگ عامه (نسبت به‌ادوار گذشته )پدید آمده چگونه میشود که باز هم حکمرانان ستمگرومستکبرین و طواغیت در عرصه جهانی

بر سرنوشت ملتها حکومت کنند؟ قبل از پرداختن به پاسخ این پرسش لازم است خاطرنشان شود که سیطره امروز مستکبران با سیطره اسلافشان تفاوتی بنیانی دارد و پرداختن به تفاوتهای کمی و کیفی، صوری وباطنی سرفصل سلسله بحث بسیار مهمی است که اگر خدا توفیق دهد در آتیه بدان خواهیم پرداخت. لکن ناگفته نمیماند که سیطره سردمداران مستکبر درجهان امروز بر خلاف گذشته با یورش نظامی آغاز نمیشود. زیرا تغییر شرایط سیاسی، اجتماعی و ارتباطات گسترده‌و انعکاس وسیع اخبار در جهان و هزینه گزاف نقل و انتقالات نظامی چنین کاری را مشکل، نامناسب و غیرمعمول ساخته است. به طوریکه امروزه بعنوان آخرین روش سلطه مورداستفاده قرار میگیرد. سیطره مستکبران امروز جهان با یورش اقتصادی وفرهنگی وتسلط در این ابعاد آغازودرادامه با تسلط سیاسی و نظامی همراه میگردد. استعمار در عصر حاضر چون گذشته صرفا" براستفاده از قدرت نظامی متکی نیست. در استعمار نو به‌جای استفاده ابتدا به ساکن از قدرت، نظامی و حضور فیزیکی در کشورهای ضعیف سعی میشود با تهاجم وسیع فرهنگی و اقتصادی و آماده شدن زمینه‌های لازم برای تسلط کامل، ساختارنظامی آنکشور به‌گونه‌ای شکل یابد تا حافظ منافع استعمارگران باشد.

و اما نکته اساسی بحث ما این است که استکبار جهانی دراستعمار به‌روش نوین بدون بهره‌برداری وسیع از علوم جدید و تکنولوژی پیشرفته هرگز نمیتوانست نسبت به نفوذ در جهان سوم وتسلط بر شریان اقتصادی و بافت سیاسی نظامی به توفیقات قابل توجهی دست یابد. دانشگاههای مشهور و به اصطلاح معتبر دنیا، مراکزو آکادمیهای علمی گسترده، سازمانها وشرکتهای بزرگ پژوهشهای علمی دررشته‌های مختلف ازصنایع، پزشکی و... تحت نفوذ مستکبران صاحب قدرت وپول اداره میگردند

تحقیقات وپژوهشهای علمی مختلف به گونه‌ای هدایت میشوند که قبل از هر چیز منافع سرشاری را روانه جیبهایشان سازد. آخرین کشفیات و ابداعات علمی مهرسری خورده وغیر قابل افشاء هستند. اگر مراکز علمی مستقل بودند میبایست آخرین تحولات رخ داده در پژوهشهای خود را برای تبادل نظر به جهان و جهانیان ارائه میکردند. لکن نه‌تنها مراحل پیشرفت هر پژوهشی مسکوت میماند بلکه هر کشف علمی در زمینه‌های مختلف نیز ابتدا به‌اطلاع سازمانهای مخوف امنیتی (حافظ منافع سرمایه‌داران بزرگ) رسیده‌و مهرسری خورده و تا قبل از بهره‌برداری کامل مستکبران از اطلاع عموم مخفی میماند.

بدین ترتیب آنان‌ابتدا به‌تولید اندک و تبلیغات وسیع دراطراف آن پرداخته و باتوجه به نیاز مبرم مردم جهان، سفارشات‌بسیار زیادی را دریافت نموده و آنگاه نسبت به تولید گسترده آن اقدام مینمایند.

بدین ترتیب ضمن آنکه با پیداکردن بازار فروش جهانی سود کلانی به‌جیب خود میریزند، پای خود را در ساختارعلمی، اقتصادی و.. کشورهای ضعیف بازمیکنند. در مرحله بعد یعنی پس از آنکه بازار جهانی را اشباع کردند به‌فروش فرمولهای محرمانه پرداخته و آنها را درقبال اخذ مبالغ هنگفت و امتیازات ویژه سیاسی نظامی دراختیار کشورهای جهان سوم قرار

میدهند.

بهره‌برداری استکبار از علم درهمین حد باقی نمیماند.بسیاری ازپروژه‌های علمی ، صنعتی در جهان دانش بنا به پیشنهاد سازمانهای اطلاعاتی ومراکز وابسته به سرمایه‌داران وتحت هدایت مستقیم آنان تعقیب میشود.

چه کسی منکر این حقیقت است که بتایج اعظم پیشرفتهای علمی در خدمت صنایع نظامی قرار دارد؟ آری امروزه درجهان بیشترین حجم تحقیقات علمی صنعتی به‌منظور ارتقاء کیفیت تسلیحات نظامی و در جهت بالا بردن قدرت سرکوب ، تخریب ،ارعاب جاسوسی واستراق عمد در استخدام جهانخواران قرار دارد. هواپیماهای جنگنده وبمب افکن و جاسوسی و موشکهای مدرن برد کوتاه و دور زد ،بمبهای شیمیایی و میکروبی، بیماری یدز ( سلاح میکروبی پنتاگون ) وسائل بسیار حساس جاسوسی و... محصولات تلاشهای علمی نخبگان فراوانی‌است که مستقیم و غیرمستقیم درخدمت دستگاه عریض و طویل نظام استکباری ومشتی سرمایه‌دار دون و زالو صفت قرار دارند. تهاجم فرهنگی دشمنان بشریت در سایه بهره‌وری ازتکنولوژی ارتباطات و سیستمهای صوتی و تصویری پیشرفته و فریبنده است که امری سهل ،سریع وعمیق گشته و دربسیاری ازموارد توفیق یافته هویت فرهنگی مردم بسیاری از کشورهای ضعیف را از آنان سلب و به تزریق فرهنگ خودباختگی از خودبیگانگی ،وابستگی و ذلت وتسلیم بپردازد. در مورد کامپیوتر به عنوان برجسته‌ترین محصول تکنولوژی جدید که امروزه کاربرد بسیار فراوانی در رشته‌های مختلف وحتی امور روزمره زندگی پیدا کرده است نیز این بحث کاملا" صادق ودرثبوت آن وضوح بیشتری وجود دارد. با نهایت تاسف باید بگوئیم که‌موارد مثبت بهره‌برداری از کامپیوتر(یعنی مواردی که در راستای منافع جامعه انسانی قرار گرفته) در مقیاس با موارد، بهره‌برداریهای سودجویان ضد بشر ناچیز است.امروز شرکتها ، کارتلها وتراستهای عظیم که‌شریان اقتصادی جهان سوم را دردست‌دارند بیش از هر مرکز وموسسه دیگری ازوجود کامپیوترها بهره میبرند. خط تولید پیشرفته‌ترین سلاحهای مخرب و مهلک وپیچیده‌ترین و حساس‌ترین سیستمهای جاسوسی وجمع آوری خبر، به طورکمی و کیفی بیشتر از خط تولید هرکالای دیگری از کامپیوتر بهره میگیرند این کامپیوترها هستند که سازمانهای مخوف جهانی را در راه‌اندازی یک سیستم بسیار گسترده ودرعین حال منسجم جاسوسی وخبرگیری به‌منظور شناسایی به‌موقع مخالفین و افزایش حجم حضور اعتباری درکشورهای تحت سلطه وفراهم‌ساختن ابزار وزمینه‌های جنگ روانی و ایجاد جو رعب ووحشت یاری میکنند و....

پرداختن به جزئیات نحوه بکارگیری ازتکنولوژی و علوم در حوصله بحث‌ما نیست وچندان‌ارتباط اصولی با اهداف طرح این مطالب نیز ندارد. ازسوی دیگر امکان آن نیست تا به همه نمونه‌ها اشاره‌شود چه این قصه سری دراز دارد.....

اکنون باتوجه به‌این مسائل، ودرچنین شرایطی تکلیف چیست ؟ چه‌راهی درپیش خواهیم داشت ؟ و به تعبیری دیگر راه دفاع از انسانیت و مکتب‌و راه دفاع از هویت مستقل فرهنگی دراین جهان پرغوغا کدام است ؟

مەزهەبی

# ئیسلام: مەیدانی خەباتبە پانایی هەمووجیهان

زۆرکەس تێگەیشتوون کە " سەرچاوە" ی ڕێگا ئەوە نیە کە ئادەمیزاد لەدرێژایی مێژوودا ناسیویەتی وپێیدا رۆیشتووە . ئەو دەستە لەگەڵ هەموو چەشنە ستەم و خراپەیەک خەبات دەکەن هەروەک ئیسلام خەبات دەکا. یا رەنگە ئەودەستە شان بە شانی زۆرلێکراوان برۆنە پێش .هەر وەک ئیسلام دەڕواتە پێش. یا بەپێی هەل و مەرج ئەو دەستە چاولەچاوی ستەمکاران دەبڕن وبەسەریاندا دەگوڕێنن هەر وەک ئیسلام دەگوڕێنێ، ئەوان کەدەزانن خەتاکار کێ یە وخەتا بە چ دەڵێن. نەزان و ڕق ئەستوور کێ یە وئەوانەی لە ئیسلام ناگەن کێن. ئەوانە تێدەگەن کێ موسوڵمانە و کێ بەدرۆ موسوڵمانە .

ئیسلام لەزاتی خۆیدا جووڵانەوەیەکی رزگاریخوازانەیە . ئەم جووڵانەوەیە لە دەروونی مرۆڤ هەڵدەقوڵێ،سەرچاوە دەگرێ وهەڵدەقوڵێ ولە مەڵبەندی کۆمەڵایەتی ئەودا پەرە دەگرێ و بڵاو دەبێتەوە و لە ئەڵڵادا تەواو دەبێ چونکە ئیسلام هەر دڵێک ئاوەدان بکاتەوە ئەو دڵە پاشان هەرگیز کلکەسووتە وتەسلیم رەچاو ناکا و بۆ زۆرداری ودەسەڵات کڕنۆش نابا تەنیا لە بەرامبەر یەزدانی پاکدا خۆ بەدەستەوە دەدا ومل بەلاوە دەنێ.دڵێک کە بە تیشکی ئیسلام رووناک بووبێ هەرگیز بەرامبەر بە دەست درێژکەر وستەمکار بێدەنگ دانانیشێ. بۆ موسوڵمان خەباتی دژی ستەم گرینگە . جا خەبات نەدژی هەرکەس بێ. هەر سوڵتانێک و زۆردارێک لە هەر جێگەیەک بێ تەفاوەت ناکا .

موسوڵمانی بەراستی کاتێک دەبینێ زوڵم وستەم دەکرێ یان هاواری ستەم لێکراوان دەبیسێ لەولاشەوە چاو لێدەکا ئۆمەتی ئیسلام کڕو کپ خۆی مەڵاس کردووە

و کارێک ناکا، ئاگر بەگیان دەبێ و لە ئیسلامەتی ئەو ئۆمەتە بێ هەست و خوستە دڕدۆنگ دەبێ چونکە نابێ دڵێک هەستی موسوڵمانەتی تێدابێ بەڵام لەگەڵ نیزامی جەوروفەساد رێک بکەوێ. لە دوو حاڵ بەدەر نیە ئەگەر نیزام نیزامی ئیسلامی بێ بەگژ هەموو خواروخێچی و ناراستی یەکدا دێتەوە وهەدا نادا و پاشەکشە ناکا. بێ ماندووبوون خەزا (جیهاد) دەکا ولە رێگەی حەق و عەدڵ و ئازادی دا بەلەز بەرەو شەهیدبوون خۆ دەکوتێ. بەڵام ئەگەر نیزام ئیسلامی نەبێ بە تەقە تەقی تەسبێح‌وهەڵگرتنی هاچەری حەرەمەینی شەریفەین ونوێژودووعا پێک نایە( فکری وردیشی دەوێ هەر بە دووعا ونوێژی مەکە!)تەوەککول بە خوا کردن وپاڵدانەوە و چاو لە ئاسمان بڕین وچاوەڕوانی هەڵڕژانی خێروبەرەکەت بوون هیچی لێ پەیدا نابێ. بەم جۆرە ئازادی وعەدالەت لەئاسمانەوە نازڵ نابێ. تەوەککولی بێ جووڵانەوە تەنیا دەبێتە هۆی چێ تر بوونی زاڵم‌وزیاترچەوسانەوەی ژێردەست .

خودای گەورە هیچ قەومێک کە بۆخۆی یاریدەی خۆ نەدا، یارمەتی نادا و ئەوانەی لەرێگەی شەریعەتی ئەودا خەبات ناکەن وەسەریان ناخا.

اِنّ اللّٰهَ لایُغَیِّرُ ما بِقَوْمٍ حتّیٰ یُغَیِّروا ما بِاَنْفُسِهِمْ.

ئیسلام باوەڕێکی شۆڕشگێرانەی بێ پسانەوەیە وناچێتە نێو دڵ ودەروونێک کە ئینقیلابی نەبێ وئاهەنگی جووڵانەوەی نەبێ. ئیسلامی شۆڕشگێرانە لە بیروباوەر وتێگەیشتنی قووڵ وئاگاداربوونەوە دایە شۆڕش لە ئاڵ وگۆڕی رەوەندی ژیان و پێوەندی تاک وکۆمەڵدا پێک دێ ودەبێتە هۆی یەکسانی وبەرامبەری لەنێوان بەرەی ئادەمیزاد. لەو شۆڕشەدا هیچ کەس لە هیچ کەس لەپێش‌تر نیە مەگەر بەپێوەری خۆپارێزی لە چەپەڵی وگوناە و کاری خراپ .

ئەم شۆڕشە لەسەر پایەی گەورەیی

ئادەمیزاد دارێژراوە وڕقەبەری وبۆق لەزگی و فەساد وخراپە وەخۆ ناکا.

هیچ ئادەمیزادێک گەرما وتینی ئەم ئیمانە هەست پێ ناکا مەگەر ئەوەی بە تەواوی بوون وهەبوونەوە لەرێگەی ئەودا، تێ بکۆشێ وبۆ هەموو ئەزموونێک ئامادە

بۆ. لەو بارودۆخەدا ئادەمیزاد لـە ڕاوەستان وبێدەنگی بێزارە وتا گەیشتن بە ئامانج وبەحەقیقەت ڕاناوەستێ.
ئەوانەی ئیمانیان بەخودا هەیە لـە ڕێگەی ئەودا خەبات دەکەن تاکلمة اللـه

عەدالەت وشەرەفی ئینسانی وەک کێـــو ڕاوەستاوە .
ئەو کەسە کە بەهێزی مێشک وباسک لەگەڵ ئیستیعمار بەربەرەکانی نـاکـا موسوڵمان نیە. ئەو موسوڵمانانەی لەگەڵ

# ان اللە لایغیر مابقوم

لە ترۆپکی بڵیندایی دابێ. "کلمة اللـه"ش نایەتە دی مەگەر ئەوەی کینەو بێداد و زوڵم وزۆر لەسەر زەوی نەمێنـــێ و ڕۆڵەکانی بەنی ئادەم وەک دەنکی شانە بەرامبەر نەبن وپێوەری جیاوازی وسەراتی یان تەنیا پارێزگاری وتەقواو دووری لە گوناهان بێ .
ئەم جۆرە تاکانە لەگەڵ زوڵم وزۆر لەهەر شکڵ وجل وبەرگێک دابێ خـەبـات دەکەن و بەقازانج یا دژی کەس زبانیان بەناحەق ناگەڕێ. ئەوانە بوون کـە لـە مێژوودا کاتێک شوعلەی ئیمـــان لـە دەروونیاندا هەڵیسا بەشێوەیەکی ڕێـک و پێک لەدژی ستەم هەستان وبەرەومەیـدان وەڕێ کەوتن. شەڕێکی گەورە و گـرانیان لـە جبهەی ئەخلاق و کۆمەڵ و فەرهەنـگ وسیاسەت وئابووری دا دەست پێکرد.
لە ئیسلامدا واژەگەلی " ئیستیعمـار فێئودال، تاغی و..." هەمووی لـەژێـر ناوی "بەغی"دا کۆبوونەوە و ئیســلام ئەمری بە ئێمە کردووە کەلەگەڵ "بەغی" و "باغی" خەبات بکەین. ئیسلام جێگـە ی شانازێ یە چونکە لەمەیدانی خـەبـاتـی جیهانی دا بۆ وەدەست هێنانی ئازادی و

زاڵم وئیستیعمار پێک هاتوون وخزمەتیـان دەکا وئاشتی یان لەگەڵ دەکا موسوڵمـان

نیە. ئەو کەسە بەرامبەر بە شەرەفـی خۆی ونەتەوەی ولەوەش گرینگ تربەرامبـەر بەئایینی خۆی غەیان وناراستە .
موسوڵمانێک کە دڵ ودەروونی نووری ئیسلامی تێڕژاوە نایەڵێ سەرمـایـەداری خوێن مژی ملهوڕ وسۆسیالیستی خوێن ڕێژ ی

زاڵم ئاسوودە دابنیشێ. بەرامبەریان رادەوەستێ وبەگوڕەی نێرانە بەسەریاندا دەنەڕێنی وگەل هان دەدا لەدژی بێدادو ستەمی ئەوانە جیهاد بکا. ئەوموسوڵمانەی کە سەرکێشی ملهوڕان* وکۆیلەتی* و دیلی

لەئێوە نیە ئەوەی لەرێگای خودا و زۆرلێکراوان وبەندکراوانی لەش و گیان تێ نەکۆشێ و بۆ رزگاری ئەو کەسانە کە دەڵێن "خودایە ئێمە لەو جێگایە کە خەڵکی ئەو ستەمکارن بەرە دەر و

# حتى يغيروا ما بانفسهم

و چەوسانەوەی گەلانی جیهان بە هێند ناگرێ وبەرامبەریان بێدەنگ و هەست و

خوستە، موسوڵمان نیە.

وَمَا لَكُمْ لَا تُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَالْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ الرِّجَالِ وَالنِّسَاءِ وَالْوِلْدَانِ الَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا أَخْرِجْنَا مِنْ هَٰذِهِ الْقَرْيَةِ الظَّالِمِ أَهْلُهَا وَاجْعَلْ لَنَا مِنْ لَدُنْكَ وَلِيًّا وَاجْعَلْ لَنَا مِنْ لَدُنْكَ نَصِيرًا.

لە لایەن خۆتەوە سەرپەرستورێبەرێکمان بۆ دیاری بفەرموو و لەلایەن خۆتەوە گەورەیەکی بینا وزانامان بۆ بنێرە" جیهاد نەکا و خەبات نەگێڕێ.

موسوڵمان بە بەڵام موسوڵمانێکی تەواو. هەر ئەوەندە بۆ تۆ بەسە. چونکە ئەگەر موسوڵمان بی ئیمان وباوەڕ لە جەبهەی ملهوڕان وئیستیعمارگەرانت هەڵدەپچڕێ ودەتباتە گۆڕەپانی خەبات لەدژی زوڵم وبیداد وملهوڕی. ئەگەر نەچوویە گۆڕەپانی خەبات وهەستت بەوە نەکرد دەبێ خەبات بکەی. بزانە لە دەروونتدا نەیرەنگ وفێڵ هەیە. یا نەیرەنگ وفێڵێکت لەگەڵ حەقیقەت تێکەڵ کردووە.

بزانە کە لەسەر زەوی مەرام ومەسڵەک زۆرن کە هەریەکەی لە بەستێنی تایبەتی خۆیدا دەچێتە پێش وخۆیان بە ئاڵاهەڵگری ئازادی وعەدالەت دەناسێنن!

بەڵام تەنیا ئیسلام لە هەموو مەیدانێکدا بەنیەتی پاکەوە و بە ئەزمی نیزیک بوونەوە لەخودا بۆپێک هێنانی ئازادی ودابین کردنی عەدالەت وقیست (قسط) بەربەرەکانی دەکا.

# ئەدەبی باسی

**وەرگێر:**

**جەعفەر شێخە لیسلامی**

هەر خوێنەرێک هیچ نەبێ جارێک بۆی هەڵکەوتووە کە دانەنانی خاڵێک (.) یان پرسیارنوێنێک (؟) سەری لێ شێواندووە و ناچار بووە ماوەیەکی زێدە لە پێویست تەرخان بدا، بۆ ئەوە کە باش لە رستە یان بابەتێک حاڵی بێ وتێی بگا.

نیشانەکان لە نووسراوەدا وەکوو "نۆت" لە مووسیقیدان. دانانی ئەو نیشانانە بەرێ وجێ، دەبێتە هۆی ئەوە کە نووسراوە رێک و پێک بێ، خوێنەر ساناتر بیخوێنێتەوە و زووتر و باشتر تێی بگا. ئاشکرایە کاتێک خوێنەر لە نووسراوە تێ گەیشت، نووسەریش بەروبۆی زەحمەتی خۆی دەست کەوتووە. کەوابوو رەچاوکردنی ئەو کارە گرینگە هەم بۆ نووسەر قازانجە و هەم بۆ خوێنەر.

لە کۆمەڵەکانی پێشکەوتووی ئێمرۆدا، نووسەرگەل لە نووسراوەکانی خۆیان دا جگە لەم نیشانانەی کە بە تەماین لەم وتارەدا باسیان بکەین (هەڵبەت لە رێنووسی زمانەکانی تریش دا، کەڵکیان لێ وەردەگرن) بۆ خۆی نیشانەی تریشی زۆرە. لەبەر ئەوەدانانی هەمووی ئەو نیشانانە هەروا سانا نیە.

بە بروای نووسەری ئەم دێرانە، نووسەرانی بەرێز بەتایبەت لاوە خۆشەویستەکان دەبێ بە بێ نێوبڕ و ماندوویی ماوەیەکی زۆرلەو بارەوە تێ بین و وردبین بن، تەنانەت کاتێک دەیانەوێ نامەیەکی زۆر بەرێ وجێ لەم نیشانانە کەڵک وەردەگرن، بەڵام بەداخەوە ئێمە هێشتا گرینگایەتی ئەو مەسەلەمان تەواو بۆ دەرنەکەوتووە، ئەگەر بۆشمان دەرکەوتبێ لەکردەوەدا لەسەری سوور نین ووەپشت گوێمانی دەدەین.

رێنووسی زمانی کوردی ئاساییش بنووسن ئەو نیشانانە بەرێ وجێ دەکار بێنن. تا ئەو کاتەی کە ئیتر دەستیان راپێ وپاشان دەبینن کە بەبێ ئەوەی پێویست بە تێ بینی و وردبینی زۆریش بێ، نووسراوەکانیان زۆر رێک وپێکە ولەم بارەوە کەموکورتی یان نیە ئەو نیشانانەی دەکار هێنانیان لە نووسراوەدا زۆر گرینگە ئەمانەن:

**خاڵ یا نوختە (.)**

١ـ لەکۆتایی رستەگەلی بەیانی وئەمری دادەنرێ و نیشانەی تەواوبوونی رستەیە.

نموونە: گەل بەویستی خۆی گەیشت."

٢ـ دوای پیتگەلێکی سەربەخۆ کە بۆ کورت کردنەوەی وشەدێن، دادەنرێ.

نموونە: ئ. س. ئ. (ئینتشاراتی سەلاحەدینی ئەیپووبی).

٣ـ دوای ژمارەکانی ئەسڵی یان پیتەکانی ئەلف و بێ دادێ و ئەوان لە وشەکان جوێ دەکاتەوە.

نموونە: ١. ٢. ٣. ٠

ت. پ. ب. ئ

**پرسیارنوێن یا داس ؟**

١- لەکۆتایی رستەکانی پرسیارانەی راستەوخۆدا دەنووسرێ .

نموونە: مامۆستا لە خوێندکاری پرسی : " ئەرێ کتێبەکەت خوێندۆتەوە ؟"
ئاشکرایە کە لە کۆتایی رستەگەلی پرسیارانەی ناراستەوخۆدا ، بە جێگای پرسیار نوێن (؟) خاڵ دادەندرێ .

نموونە: مامۆستا لە خوێندکاری پرسی کە ئایا کتێبەکەی خوێندۆتەوە ؟.

٢- جاروبار بۆنیشان دانی مەبەستێک کە بۆشک لێ کردن یان گاڵتەپێکردن دەبێ کەڵکی لێ وەردەگیرێ. لەم کاتەدا زۆرتر لەنێو دوو کەوان دا جێ دەگرێ.

نموونە: لە وڵاتی ئەمریکا دیموکراسی (؟) بەرقەرارە .

هەواڵنێری بەشەرەف (؟) نامەی تایبەتی منی- ئەویش بەدەست تێوەردانەوە- لە کتێبەکەیدا چاپ کرد .

٣- لە کۆتایی بەشێکی رستەدا کەشێوەی پرسیاری هەیە دێ. (هەڵبەت لەم حاڵەدا تەواوی رستەکە پرسیارانە نیە ).

نموونە :کتێبی **بۆچی دەبێ لەبیری کۆمەڵ دا بین ؟ م** خوێندەوە .

**! سورنوێن یا گورز (!)**

لە کۆتایی وشە یا رستەگەلێکدا کەبۆدەربڕینی دڵەکوتە وسەرسوڕمان یان پێ راگرتن بن،جێ دەگرێ .

نموونە :کورە تۆزۆرئازای !
نەکەی درەنگ بێیتەوە !

**وچانوێن یان گۆچان (،)**

بۆ جوێ کردنەوەی وشەکان یان بەشگەلی رستە بەکار دێ .

نموونە : حاجی قادری کۆیی، شاعیری نەمری کورد ، لە چەرخی نۆزدەی زایینی دا ژیاوە .

**جیایی نوێن یان فەنەر(؛)**

بۆ جوێ کردنەوەی دوو یان چەند رستەی بەیانی کورت کە لەگەڵ یەکتر پێوەندی یان هەیە، بە کەلک دێ .

نموونە :مەحوی نەیگەیاندۆ- تە نالی؛ سەرەڕای ئەوەش یەکێک لە گەورەترین شاعیرانی کلاسیکی کوردە .

**دوو خاڵ (:)**

١- بەر لە گێڕانەوەی راستەوخۆ دێ .

نموونە: هێمن گوتوویە :
" ئەوین مایەی ژیان و بوون وسانە .
" ئەوین رایگرتووە دەوری زەمانە ."(١)

٢- بۆبڵاوکردنەوەودیاری کردنی کوت‌کوتی مەبەستێکی گشتی یان شی کردنەوەی مەسەلەیەکی کورت بێژراو بەکار دێ .

نموونە :بەرنامەی کار بەم جۆرەیە :.....

٣- بەر لە بابەتێک کە وەکوو دووپات‌کردنەوە یان شەرح کردنی بابەتی بەر لەوە ، دێ .

نموونە : چارەیەکمان جگەلە خەبات‌نیە : رێگایەکی تر نیە .

٤- پاش‌سەردێڕی نامە دێ .

نموونە :دۆستی خۆشەویستم :

٥- لەنێوان ژمارەی سەعات وژمارەی دەقیقەدا دادەندرێ .

نموونە : ٥:٣٠ی پاش نیوەرۆ.

**... سێ خاڵ (...)**

١- بەجێگای یەک یان چەند وشەی قرتاوادادەندرێ .

نموونە : سەردەمی زۆرەملی، نەزانی،خۆپەرستی ... **نەما**.

٢- لەباتی وشەیەکی وەکوو "هتد" دادەندرێ .

نموونە :شاعیر دەبێ مەسە- لەکانی فەننی شیعر،قافیە، رەدیف ،وەزن ...بەشبە حاڵی خۆی بزانێ .

هەر کاتێک،نیشانەی سێ خاڵ لەکۆتایی رستەدا بێ ، نیشانەی کۆتایی رستە ، بەر لەو دادەندرێ .

نموونە : رەورەوەی مێژوو بەرەوپێش دەڕوا ، ئینسانەکان روون دەبنەوە ، ئیستعدادەکان دەپشکووێن گەلان رزگار دەبن....

قرتاندنی یەک یان

چەند میسرەع یان بەیتی شیعرێک یان جاروبار یەک یان چەند رستەی پەخشانێک بە چەند خالّان نیشان دەدەن .

نموونە :

"بولبولی بالّ شکاوی
وەختی گولّم
هەر شەپۆلان دەدا
دلّی لەکولّم
"چۆن دەتوانم بەتۆ
بلّێم من چیم ؟!
خۆم گومانم هەیە کە
هەم یا نیم ؟! "(٢)

لە پەخشان دا دەکرێ هەر سێ خالەکە دابندرێ .

نموونە :"بەبیرم نایە بە منداڵی قەت بیرم لەوە کردبێتەوە کە بە گەورەیی ببمە شاعیر.... بۆم ناچێتەوە سەریەک ، بۆچی کەچووم مەحوجرەی فەقێ یان بەجارێک گۆرام و ئاشقە شیعر بووم ."(٣)

**بڕ نوێن یان هێلّ(—)**

١- بۆ کردنەوەی بابەت یان هێنانەوەی رستە و بابەتی روون کەرەوە بەکار دێ .

نموونە : زمانی کوردی رەسەن–بەراستی زمانێکی شیرینە کوردی رەسەن–لە خەلّکی دێهات فێر بووم .

٢- بۆ دووپات کردنەوە یان شەرح دانی بابەت دادەندرێ .

نموونە :ئاو–ئاوێکی روون– پڕ بە رووبار دەهات .

٣- بۆ کۆکردنەوە و پەستاوتنی بابەت لەکار دەکرێ .

نموونە :ئینسان خۆشویستن، بوێری ولەخۆبوردوویی— ئەمانەن تایبەتگەلی ئینسانی راستەقینە .

٤- بۆ نیشان دانی مەودا بەکار دێ .

نموونە :رێگای سنە–مەهاباد

هەر وەکی دەبینین جاری وایە هێلّێک و جاری واشە دوو هێلّ دێتە نێو رستە .

**پێکەوە نوین یا نیوە هێلّ(-)**

١- بۆلکاندنی وشەکان دەکار دەکرێ .

نموونە : خاووخیزانی مێ- وەجاغی یەکێک لەشێوەکانی کۆنی خاووخێزانە .

٢- بۆ بەش بەش کردنی وشەکان کەلکی لێ وەردەگرن

نموونە : د-ا-ر(= دار)

٣- بۆ پێ داگرتن یان دووپات کردنەوەی پیتەکانی وشە لەکار دێنن .

نموونە : م-م-منیش . ماما- ماتم وە-وە-کوو تۆ-تۆ- تۆ ئەئە-ئەتۆش ما-ما- ماتی م-م-من .

٤- بۆ نیشان دانی ناتەواوی وشەیەک کە لە کۆتایی هێلدا هەلکەو- تووە وبەشێکی کەوتۆتە هێلی پاشەو بەکاردێ .

نموونە : زمانەکەمان پێ ناسی ئێمەیە ، لەبەرئەوەپێو- یستە بۆ گەشەکردنی هەتا دەتوانین خزمەتی بکەین .

**کەوان ( )**

بۆروون کردنەوەیەکی زیادی یان وەبیرهێنانەوەی مەسەلەیەک لەنێو بابەتی ئەسلیدا کەلکی لێ وەردەگرن .

نموونە : هێکێل ( کە نابێ لەگەلّ هێگێلّ لێمان تێک بچێ) یەکێک لە سروشت ناسانی گەورەی چەرخی نۆزدەیە بابەتی نێو دوو کەوان زۆرتر لە بابەتی نێو دوو هێلّ، لە بابەتی ئەسلی دوورە .

**« »**
**زەق نوێن یان دوو کۆچان**

١- لە سەرەتا وکۆتایی گوتەیەک دا کە راستەوخۆ لەزمان کەسێک یان سەر چاوەیەکەوە دەگێردرێتەوە جێ دەگرێ .

نموونە : مەحوی گوتوویە :

"بەجێ یە کوشتنم سووتاندنم ،خاکت بە با بۆدام ؟! "

" وتی : ئاهەنگی عیشقی من مەقاماتە لەگەلّ بەستە"

ئەگەر بابەتی گێردراوە ، درێژ و لە چەند بەند ( پاراگراف) پێک هاتبێ زەق نوێن لەسەرەتای هەموو بەندەکان وتەنیا لەکۆتایی بەندی دوایی دا دێ .

٢- لە سەرەتاوکۆتایی

زاراوەگەلی تازە یان داتاشراو و وشەیەک دا کە پێی لەسەر دابگیرێ ، لە رستەدا جێ دەگرێ .

نموونە :وشەی " فەرهەنگ " لە زمانی ئالّمانی دا دەبێتە " کولتوور"

٣- بۆ دیاری کردنی سەردێڕ وتار و نامیلکە گەلی ناسەربەخۆ وقسەکردن وبەشەکانی کتێبێک لەم نیشانە کەڵک وەردەگرن .

نموونە :"لەکوێ وە بۆکوێ؟" پێشەکی مامۆستا "هێمن "٥، بۆدیوانی "تاریک وروون".

هەرکات پێویست بێ کە یەک یان چەند وشە لە وشەکانی نێو ئەمنیشانەیە بەنۆبەی خۆی زەق بکرێ ، پێش وپاشی ئەو یەک یاچەند وشەیە ، کەوانی تێک شکاو واتە< >دادەنێن .

نموونە : قسەکەر گوتی: "وشەی <گەوهەر> هەر <جەوهەر>ی عەرەبی یە ."

**زێدەنوێن یان قولاپ [ ]**

١- بۆ دیاری کردنی وشە یان وشەگەلێک کە لە نووسراوە یان سەردێڕی کتێبێک زیادی دەکەن ،ئەو وشە یان وشانە داوێنە نێو ئەو دوو قولاپە .

نموونە : قازی ئەحمەد نووسیویەتی :

" شاعیری فەرزانەی فرەزانی کورد [هێمن] ئەوەی بۆ روون ببۆوە کە هەر فەرهەنگە نامرێ." (٥)

٢- ئەگەر لەنێو بابەتێکدا کە بۆخۆی کەوتۆتە نێو دوو کەوان روون کردنەوەیەک پێویست بێ ئەو روون کردنەوەیە داوێنە نێو قولاپ .

نموونە : هێگێڵ (کە نابێ لەگەڵ هێگێل [فەیلەسووفی پیتۆڵی ئاڵمانی] لێمان تێک بچێ ) یەکێک لە سورشتناسانی گەورەی چەرخی نۆزدەی زایینی یە .

**گەورەنوێن یان هێڵی درێژ :**

بۆ زەق کردنی هێندێک وشە یان سەردێڕی دەست نووس و نوسراوەکانی ماشینی لەژێر ئەو وشە و سەردێڕانە هێڵێکی راست دەکێشن .ئەگەر بابەتێکیش پێویست بەزەق کردنەوە بێ بەڵام زۆر گرینگیش نەبێ لەژێر ئەوبابەتە هێڵێکی خێچ وخوار دەکێشن .

نموونە :**مەموزینی خانی** شاکارێکی ئەدەبی یە .

**" من لەو بروایەدام کە شەرەفنامەی هەژار دەبێ بکرێتە بەردی بناغە بۆ کوردی ئەدەبی و زمانی یەکگرتوومان ."**

لەنووسراوەکانی چاپ کراودا لەبابەتی ئەوە کە لەژێر وشەکانی گرینگ هێڵ بکێشن ،زۆرتر ئەو وشانە بەپیتی گەورەتر یان رەشتر لەسەرجەمی نووسرا - وەکە چاپ دەکەن .

**دوا سەرنج**

لەنووسین دا دەبێ هەوڵ بدەین کە مەودا و نێوانی ئەم نیشانانە لەگەڵ وشە و رستەکان بەپێی مەنتیقی کەلام بەرێ وجێ بێ .

نیشانەکانی تاق وەکوو خاڵ (.) وپرسیارنوێن (؟ ) دەبێ بەمەودایەکی کەم و باشلەدوای وشە یان رستەدا دابندرێن ،بەڵام دەبێ مەودای ئەو نیشانانە لە گەڵ وشەی پاشەوان،زۆرتر بێ .

پێکەوەنوێن (-) کەدوو وشان بەیەکەوە دەلکێنێ دەبێ مەوداکەی لەهەردووک وشە کەمووبەقەت یەک بێ .

مەودای هەردووک لای هەموو نیشانەیەکی جووت لە وشە یان رستەیەکی کە لە نێوان ئەوجووتە نیشانەدا هەڵکەوتووە ،دەبێ مەوداکەی کەمتر بێ لەووشەورستانەی کە لە ئەملاوئەولای ئەو نیشانەیە هەڵکەوتوون .

**سەرچاوەکان :**

١- هێمن : نالەی جودایی ، ل ، ٥٩ .
٢- هێمن : نالەی جودایی ، ل ، ٤١ - ٤٠ .
٣- هێمن : هەواری خاڵی ل ، ٨ - ٧ .
٤- مەحوی :دیوانی مەحوی ل ، ٢٦٧ .
٥- سروە :ژمارە ٦،ل،٦ .

کارێکی هەرە بنەڕەتی کە لە سەرانسەری کوردستان بە تایبەتی لە نێو گوندی و رەوەندان باوە مەڕداری وتەرش داری یە . زوربەی کارەکان لەنێو گەلانی دونیادا خاوەنی رێ و رەسمێکی تایبەتین . یانی لە بارەی رێکەوتنی ئەو کار یان بەدەست هێنانی بەرهەمەکانی ئەوکارە رێ ورەسمێکی تایبەتی دادەمەزرێ بۆ وێنە رێ ورەسمی " بەران بەردان" یا " پەزبڕ" کە لەنێو کوردان هەیە یا جەشنی ترێ لەنێو ئاشووری یەکانی ئێراندا کە لە کاتی گەیشتنی ترێ بەرێوە دەچێ . لەم گوتارەدا دەمانەوێ خوێنەرانی بەرێز لەگەڵ رێ و رەسمی "بەرخ شۆ" ئاشنا بکەین .

نێوەڕاستی هاوین کە رادەی گەرما دەگاتە پلەی هەرە ژوور، مەڕدارەکان خۆیان بۆ بڕینی بەرگن یا لوایی بەرخەکان تەیار دەکەن . بەرخەکان لەو دەمەدا کەپێنج شەش مانگەن جودا لە مێگەل لە لەوەڕگایەکی تایبەتیدا بەخێو دەکرێن .

چەند رۆژ بەر لە "بەرخ شۆ" شوان و بەرخەوانەکان حەقی شەش مانگەیان کە بەشی زۆر لەکاتی حەق بڕینەوەدا "بەرخ" یا "کار" دیارکراوە لە مەڕدارەکان وەردەگرن . پاش تەواوبوونی حەق وەرگرتن کاتی شۆردنی بەرخانە . رۆژی شۆردنی بەرخان بەرۆژی"بەرخ شۆ" بەناوبانگە . مەڕدارەکان هەموو لەو رۆژەدا لە رەخ چۆم یا کانی ئاوایی یان هۆبە کۆ دەبنەوە بەچیم وگڵ وبەرد بەندێک لە پێش ئاو هەڵدەبەستن .ئاوی چۆم و کانی لە پشت ئەو بەندەدا کۆ دەبێتەوە و قووڵتر و زۆرتر دەبێ . هەڵبەت لە برێک ناوچە لە تاڤگە و ئاوهەڵدێرەکانی تەبیعی یا دەس کرد کەلک وەردەگرن .

کاتی شۆردنی بەرخ چەند کەس لە شوان و بەرخەوان و لاوە گەنجەکان دەچنە نێو ئاو، چەند کەسیش بەرخەکان داوێنە سەر دەستیان و خەریکی شۆردنی بەرخەکان دەبنەوە . لەگەڵ شۆردنی بەرخەکان گۆرانی وشیعر وئیستران و لاوکیش دەگوترێ . یاری و گاڵتەوگەپ هەر درێژەی هەیە . بەرخ شۆیەکان بە یەک دەنگ گاز دەکەن . هەزار کرێ ،هەزار برێ ، مەبەستیان لەم رستەیە ئەوەیە کە خاوەنی ئەو بەرخانە سالێ هەزار بەرخی خۆی ببڕێتەوە و هەزاریش بکرێ . ئەڤە خۆی جۆرە پارانەوە و دوعایەکە . لەم رۆژەدا منالەکانی ئاوایی یا هۆبە لە هەموان شادتروخۆشحاڵترن

کەیبانووەکانیش ئەرکێکی دیکەیان هەیە .
ئەوانە دەبێ کە بۆ بەرخ شۆیەکان هەڵوایەکی
تایبەتی بەناوی " مرتۆغە" دانێن . مرتۆغە
هەڵوایەکی تایبەتی ڕۆژی بەرخ شۆیە کە لە
ئاردی گەنم و ڕۆنی خۆماڵی ودۆشاو یا شەکر
پێک دێ . ئەو هەڵوایە بووەتە خۆراکی
سوننەتی ..

هەر ماڵێک لەو ڕۆژەدا دەبێ مرتۆغەدانێن
دەنا پێیان وایە کە هەر ماڵێک مرتۆغە
لێ نەنێن بەرخەکانیان تووشی نەخۆشی دەبن و
لەنێو دەچن .

لەو مرتۆغەیە بە هەموو ئەوانەی‌کە لە
بەرخ شۆ بەشدار بوون و هەروەها بە تەواوی
ئەوانەی‌کە لەوێن و هەر وسان بە تەواوی
ڕێبوار ودراوسێ یان دەدەن و دەڵێن کە
دابەش‌کردنی مرتۆغە لەنێو دانیشتوانی
ئاوایی یا هۆبەدا دەبێتە هەگەری دووربوونی
قەزاوبەلا لە خۆیان وبەرخەکانیان . بۆیە
لەسەر لێنان و دابەش‌کردنی مرتۆغە زۆر
سوورن و حەتمەن هەموو ساڵێ لەو ڕۆژەدا ،
دەبێ مرتۆغە هەبێ .

بەرخ بۆ دوو مەبەست دەشۆرێ ، یەکەم
مەبەست لە شۆردنی بەرخ ئەوەیە کە بەرگنی
بەرخەکان تەمیز وپاقش بن .

دووەم ئەوە کە شۆردنی بەرخ دەبێتە
هەگەری لەنێوچوونی نەخۆشی بەرخەکان و هەر
وەها لەنێوچوون و قڕبوونی گەنەوقرنوو
و ئەسپێ لەسەر لەشی بەرخ .

پاش شۆردنی بەرخەکان ئەوانە لە لەوەڕ-
گایەکی بەربەرۆژ دەلەوەڕێنن داکوو لوا و
بەرگن یان وشک بێتەوە . ڕۆژی بڕینی
بەرخەکان، بەرخ لەلەوەڕگەیەکی نێزیک
ئاوایی یا هۆبە دەلەوەڕێنن . بەشی زۆری
مەڕدارەکان خۆیان دەتوانن بەرگن یالوایی
بەرخەکان ببڕن . ئەگەر کەسێک نەیزانی ئەو
کارە بکا ، لە شارەزا یارمەتی وەردەگرن .
ئەوانەی لەوکارەدا شارەزان "برینگ بڕ" یا
" قوسێسی" یان پێدەڵێن . برینگ بڕ بە
مەقەستێکی تایبەتی بەناوی " برینگ " یا

" هری برینگ " کەزۆرجاران لە زاراوەیی
کرمانجی ژووروودا " هەربینگ "یش دەگوترێ ،
خوری مەڕ یان بەرگنی بەرخی پێ دەبڕنەوە .

کاتی برینگی بەرخ یا مەڕ هەرچوار
لاقیان بە بەندێکی تایبەتی بەناوی "پێ پەز"
یا " پێ بێند" گرێ دەدەن ،تا بەرخ یا مەڕ
خۆ لێک نەدا و کاری برینگ هاسان تر بێ .

"دیوانی ئەسعەد مەحوی" یەکەم بەرهەمی* چاپکراوی خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا ئەسعەد مەحوی یە (١٣١٨ ک – ١٨٩٨ . ز – ١٣٩٦ . ک و ١٩٧٦ .ز ) کە لە سالی ١٩٧٠دا پێشکەشی باخچەی ئەدەبی کوردی کردووە .ئەو شیعرانەی کە لەم بەرگەدا کۆکراونەتەوە بەشێکی کەمە لە گولزاری شیعری تەڕ وپاراوی شاعیری لێهاتوو و بەهرەوەری ئەم شوێنە .

ئەم زاتە پیاوێکی ئایینی ولەخوا ترس و زیرەک و بێ ریا بووە سالی ١٨٩٨ زایینی لە گەڕەکی چوارباخ ـ ی سلیمانی ولەبنەماڵەیەکی ناسراوی مەلازادە وشیعروزانست پەروەردا چاوی ژیانی بە کوردستانی زێد و نیشتمانی هەلێناوە. لە سالانی ١٩٣٠ بەدواوە ناوبانگی سیاسی و نیشتمانپەروەریشی چووەپاڵ شۆهرەتی بیروباوەڕی ئایینی .

ژینامەی شاعیر :

مەلا ئەسعەد کوڕی شێخ خالید کوری زانای شاعیری موتەسەوف وفەیلەسوفی بەرز وبەڕێزی کورد ،کوری شێخ مەلا عوسمانی بالخی یە . تەخەلوسی شیعری "ئەسعەد"ە .شاعیرێکی هەقبێژ و خواناس ولەباری شیعر گوتن دا دەستێکی بالای بووە ، شاعیرانی کورد نالی و کوردی و مەحوی کاریان تێ کردووە و تەئسیریان لەسەر داناوە. باسی رەخنە و پلار و تانووتلە نێوەرۆکی شیعری ئەسعەد مەحوی دا وێنەی زۆرە شیعرەکانی لە پلەیەکی بەرزی هونەری و قیکریدان .

لە پێش خوێندنی لای باوکی بووە ( ١٨٧٥ ١٩٦١ ) ئەوجا لە قوتابخانەی فەقێیان لە خزمەت " خواجەئەفەندی" قورئانی پیرۆز و هێندێک لە کتێبە ئایینی یەکانی ئەودەم و چاخەی خوێندووە. سالی ١٩١٥ . ز. نراوەتە قوتابخانەی ( اعدادی)یە لەسلێمانی.هەروەتر وەک فەقێکانی ئەو رۆژگارە بۆ خوێندنی مەلایەتی گەلێ مزگەوت و شوێنان چووە ، پاش ماوەیەک بایداوەتەوە سلێمانی و بۆ زێدە فێربوونی زانستە دینی یەکان دەچێتە کن مەلا گەورە و زانا ناودارەکانی وەکوو مەلا حوسێنی پێکەندی وشێخ بابا عەلی شێخ عەبدوللای تەکیە و شێخ عومەری ئیبنولقەرەداغی . لەسەر دەستوور و پەیڕەوی ئەورۆژگارە خوێندنی حوجرەی تەواو کردووە. و لە لای زانای بەناوبانگی کوردمامۆستا **مەلا حوسێن** پێکەندی یەوە ئیجازەی عیلمی وەرگرتووە .

دوای وەرگرتنی ئەو بڕوانامەیە ئینجا لە مزگەوتی خومخانە لە سلێمانی بە ئیمام و مودەریس دامەزراوە و دەستی کردووە بە پێش نوێژی و بلاوکردنەوەی ئایین ودەرس گوتنەوە

بە فەقێ یان . پاشان لەبەرپیری وبێ تاقەتی باوکی رەحمەتی یەوە دەچێتە خانەقای مەحوی و لە جێ و شوێنی باب و باپیری دادەنیشێ ئازایانە و بوێرانە کەوتە کاو و کۆشش دژی نەزانین و دواکەوتوویی پەرەپێدانی رۆشنبیری و بێداری ،زۆر کەسی فێری خوێندەواری ونووسین کردووە ورەوشت وئاکاری خواناسی وخەڵک دۆستی و ئامۆژگاری جوانی بە ناوچە جۆراوجۆرەکانی و وڵاتی کوردەواریدا بڵاو کردوتەوە .

مامۆستای شاعیری سەربەقوتابخانەی شیعری کلاسیکی کوردیمان، لە مەیدانی زانستی زماندا عەرەبی وفارسی وتورکی بەئاخافتن و خوێندنەوەوە باش زانیوە و وێنەی مامۆستا و شاعیرانی سەردەمەکەی بە هەر سێ زمانەکە شیعر و پەخشان ونووسینی پێ بڵاوکردوونەتەوە و خوێندەواروروۆشنبیرێکی قابیل وبلیمەتێکی چەرخی خۆی بووە . لە دامەزراندنی ( کۆمەڵی برایەتی)دا ئەندامێکی کارا و گورج و گۆڵ بووە ئەم کۆمەڵەیە لە ساڵی ١٩٣٧دا هاتە کۆری خەباتی سیاسی یەوە و تاکوو ساڵی ١٩٣٨ بەردەوام بوو

شاعیر دوای چەرمەسەری و راونان و گرتن و ئازادبوونی لە گرتووخانەکانی کەرکووک و سلێمانی ، ساڵی ١٩٤٢ بەهۆی زەبر و ستەمی پیرە کەمتیارە ئینگلیزەکان ونووری سەعیدی گۆڕبەگۆڕەوە (١٨٨٨ - ١٩٥٨) بۆماوەی چەند ساڵێک دەربەدەر و هەڵوەدای ئەو لاو ئەولا بووە و بە تایبەتی لە شاری "سەردەشت"ی کوردستانی ئێراندا ماوەتەوە . ئەوەتا شاعیر خۆشی لە ژیانی ئاوارە بوونەکەی خۆی کە لە تشرینی دووەمی ١٩٤٣ لە "سەردەشت" دەبێ دەدوێ و دەڵێ :

**مەرحەبام ئەمرۆ لەدڵ کرد غەم وەرامی دامەوە**
**گوڵ پەرستی کاری من بوو ئێستەبێ گوڵ مامەوە**
**جەژنەپیرۆزە لەگەڵ کێدا بکەم گەردوونی دوو ن**
**کوندەبووم ئاسا لە "سەردەشتا "بەتەنیا مامەوە**

* * *

**منلە دەس جانی وەتەن ئاوارە بووم**
**دڵ حەزین و سینە پارە پارە بووم**
**عاشقی رووتم بە رووتی دێمە . دەر**
**لەم گرێ و قۆرتە سەرم خەی بێ خەتەر**

مامۆستا خاوەنی بیروهۆشێکی بەربڵاوو خوو و رەوشتێکی بەرزی مرۆڤایەتی و جەماوەری بووە ، بەهۆی فەقێ یەتی و چالاکی سیاسەت و کوردایەتی یەوە گەلێ مەڵبەند و شوێنەواری کوردستانی عێراق وئێران بوونەتە جێگەی ژیانی . لەگەڵ کەڵە پیاوانێکی وەکوو شێخ مەحموود و محەممەدئەمین زەکی و رەفیق حیلمی وشێخ لەتیفی حەفیددا تێکەڵی و دۆستایەتی یەکی بە تین و توانی هەبووە و خۆی بە هاورێ وبرای هەموو دڵسۆزێکی بەهەقی کورد زانیوە نامەگەلێکیانی بۆ هاتووە و ئەمیش بە پەخشان یان بە شیعر وەرامیانی داوەتەوە ، یان ئەم نامەی بۆ ئەوان ناردووە و ئەوان وەڵامیان داوەتەوە . ئەم هاوپەیوەندی و دۆستی یەی مامۆستا مەلا ئەسعەد وەک گوتم تەنیا لەسنووری کوردستانی عێراقدا نەبووە ، بەڵکوو لە رووناکبیرو رۆشنبیرانی کوردی کوردستانی ئێرانیشەوە کاغەزی بۆ هاتووە و بەبیروباوەری کوردانەو تەواوی سۆزی خۆشەویستی وراستی و دڵپاکی و وەفاداری یەوە وەڵامی داونەتەوە . ئەم کارە ، یان ئەم پەیوەندگرتنە لەگەڵ شێخ لەتیفی حەفیددا زۆر روون و رەوایە .

ئەوەتا ( شێخ لەتیف)لەنامەیەکی شیعریدا کە بۆ هاوەڵی ئازیزی خۆی (مەلا ئەسعەد) ی ناردووە دەنووسێ :

**یادی تۆ هەروا لەدڵ دا ،دوستەکەی خاوەن وەفا**
**رەبی مەحفوزبی عەزیزم ،تۆ لەسەد دەردو بەلا**
**ماوەیەکە تۆم نەدیوە وا بەشێوە حاڵەکەم**
**دڵ لە لاتە ، بازەمان چەوت وچەوێڵ بێ و پڕ**
**جەفا ....**

( مەلا ئەسعەد)یش بەم شەوق وهەستەناسکەیەوە

پێشوازی لێ کردووە و وەڵامی نامەشیعرییەکەی شێخ لەتیفی (١٩١٧ – ١٩٧٢) بەپارچەغەزەلێک داوەتەوە کە دەفەرمووێ :

**دڵ لەزیندانی غەما بوو نامەکەت رزگاری کرد**
**بوو بەمەرهەم زامی جەرگ و سینەکەی تیماری کرد**

**بۆمژینی خونچەی لێوت سەراسەر بوومە دەم**
**مل شکاوە بۆنی زەرف و کاغەزی دڵداری کرد**
**سروەیی رەحمت کەجولاّ هەوری تالّی دا یەبەر**
**باغی تەبعم هاتەجیلوە ،تۆزی حەسرەت باریکرد**

گوتمان تانەوتەشەر لە نێوەرۆکی شیعری ئەسعەد مەحویدا نموونەی زۆرە . ئەمشیعرانەی لێرەدا دەیانخەینە بەرنیگای بیروبۆچوونی خۆمان بریتین لە دەربڕینی نارێکی باری کۆمەلاّتی و ئەخلاقی ..شاعیر دەردی کۆمەڵ دەستنیشان دەکا وبەچاوی رەخنەگرێک سەیری ناقۆلاّیی و رواڵەتبازی وناراستی مرۆڤی ئەحمەق و کۆمەلّی ...کردووە . شاعیرکەشەیدای نیشتمان بووە ،دوژمنی باوەکوشتەی ئەو جۆرە کەسانە بووە و بەچاوی نزم تەماشای کردوون و بەکوڕی رۆژی لە قەڵەم داون .چونکەتەنیا هەڵپەیان لە پێناو بەرژەوەندی و کارسازی تایبەتی خۆیاندا بووە و بەس .

**گورگی دووپێ هێندە زۆرە ، گورگی چوارپێ کەم بووە**
**پیاوی غەمخۆری نەماوە بۆیەغەمبێ خەم بووە**
**عەقلی چی ؟ دانیش چی یە؟ بێ دانیشی باوی هەیە**
**باری کرد شەرم‌وحەیا ئەم عالەمە بێخەم بووە**

بەلاّم ئەم دەردە کۆمەلاّیەتی یەی چاکتر بۆدەر – کەوتووە و هەستی پێ کردووە .نووکی قەڵەمی رەخنەگرتن روو دەکاتە دەستەیەکی چەپەڵی نەفام وشڕەخۆر و وێڵ ورەوشتنزم کە هیمەت و مروەتی پیاوەتی یان تێدا نابینێ .

**بە ئیمدادم کەوە پیری بوخارا**
**منم ، بێ کەس لەنا و جانی لەشارا**
**ئەوی فتوا بە ناحەق نەداتن**
**وەکوو مەنسوور ئەوائەیکەن بەدارا**

مەلا ئەسعەد گەیشتۆتە رادەی ئەوە کەلەفڕ و فێڵ و چەوتی خەلّک بگا و بە چاوی سووک سەیری رێژیمی کۆمەلاّیەتی بکا و نارەزایی خۆی لەباری ساختەکاری و پڕو پووچی و نادروستی ئەو دەردە دەربڕێ .

مەبەست وبابەتەکانی شیعری مەلا ئەسعەدی مەحوی لەم بەشانە پێک هاتووە .

* کۆمەلاّیەتی
* نیشتمانی
* جوانی ودلّداری
* ئایینی وسۆفیەتی
* شین و لاواندنەوە
* نامەی دۆستان

لە بەرهەمی چاپکراوەکانی شاعیر :

١– دیوانی ئەسعەدمەحوی، بەشی یەکەم .
٢– عقائد الرحمانیه .
٣– تحسین البیانیه .
٤– شرح علی العقائدالرحمانیه .

جگە لەمانە دیوانە شیعرێک و...یادداشتەکانی کە لەبارەی چۆنیەتی بەدی هاتنی (کۆمەلّی برایەتی)یەوەیە هەیە و لە لایەن ئەدیبی هێژا مامۆستا عەبدوللاّ عەزیز خالید ( ئاگرین)ەوە پارێزراوە .

لەتەمەنی (٧٨) سالّی ولەرۆژی ٢٥ نیسانی ١٩٧٦دا بەدەم ئێش وئازاری نەخۆشی شێرپەنجە – وە لە سلێمانی کۆچی دوایی کردومالّ ئاوایی لە دنیای ئەدەب و فەرهەنگ وزانست کرد .

لەسەر گفت و وەسیەتی خۆی لەژێردارئەرخەوانەکانی مەلّبەندی گۆڕخانەی گردی سەیوان ، تەرمونازداری بەخاک سپاردراوە .بەلاّم یادگاری ئەدەبی ئەو تا دنیا بێ بەنەمری لەناوماندا دەمێنێتەوە .

ئەم مەڵبەندو شوێنەی کە ئەمڕۆ بەناوی کوردستان ناودێرە، بەسەر چوار وڵاتی ئێران، عێراق، سووریە و تورکیەدا دابەش کراوە، زیاتر لە سێ هەزار ساڵی مێژوویی یە کە نیشتمان و شوێنی دانیشتنی گەلی کوردە.

لێدوان و لێکۆڵینەوە لە مێژووی لەمێژینەی کورد یەکێک لە پڕگرێ ترین باسەکانی مێژوویی یە. و تا ئێستاش بۆ ئەو کەسانەی لێ یان کۆڵیوەتەوە نەڕەخساوە* تا بەپشت پێ بەستن بە بەڵگەی باوەر پێکراو، پەنجە بۆئەم باسە راکێشن.

دەگەڵ ئەوەی کە سوور کردنەوە وروون کردنەوەی مێژووی گەلی کورد گەلێک دژوارە، بەڵام بەڵگەی باوەڕپێکراوی بەدەستەوەیە کە بەپشت پێ بەستن بەوانە دەکرێ هێندێک لە کەلێن و قوژبن وکون و کاژێرە تاریکەکانی مێژوویی کورد روون کەینەوە.

لەکۆتایی هەزارەی سێهەم وسەرەتای هەزارەی دووهەم پێش میلاد هۆزە جۆرا و جۆرەکانی ئێرانی واتە ئاریایەکان لە جەنووبی ئاسیای ناوەندی یەوە بەرەو

ئێرانی ئەمڕۆ داگەڕان و روویان لە رۆژئاوا و رۆژ ئاوای جەنووبی ئێران کرد. لەو سواڵەت* وشوێنەوارە مێژوویی یانەی کە لە ئاشووری یەکانەوە بەجێ ماون ، دەردەکەوێ کە لە کۆتایی هەزارەی دووهەم و سەرەتای هەزارەی یەکەمی پێش میلاد هۆزەکان و تۆرەمەکانی ئێرانی لە خۆرئاوا ورۆژئاوای جەنووبی ئێران بەتەواوی نیشتەجێ بوون ، کە تۆرەمەی فارس و ماد لەو ریزەدان .

مادەکان و فارسەکان ناودێرترین تۆرەمەی ئێرانین کە لە رۆژئاوا و خۆرئاوای جەنووبی ئێراندا نیشتەجێ بوون ، بەڵام دەبێ ئەوە بسەلمێنین کە هاوچەرخ لەگەڵ مادەکان وفارسەکان هۆزی تریش چوەک دانیشتوانی پێشووی ئەمناوچە، چ وەک هۆزەکانی کۆچەری ئێرانی لەم مەڵبەندەدا ژیاون ولە پێک هێنانی دەوڵەتی سەربە خۆی ماددا بەشداریان کردووە. بۆ وێنە داریووشی یەکەم لە تاشەبەردە هەڵکەندراوە نووسراوەکانی بێستووندا جگە لە هۆزی ناودێری ماد هۆزێکی دیکەش بەناوی ئیسکارتی ناودەبا کە لەهەرێمی ماددانیشتەجێ بوون ووەک ئەوان لە فارسەکان راست بوونەوە.

مادەکان یەکێک لە پێگەیشتووترین هۆزەکانی ئێرانین ، کەلە جەنووبی ئاسیای ناوەندی یەوە بۆ ئەو ناوچەیە کۆچیان کردووە وشۆڕ بوونەتەوە. کوردەکان پێ یان وایە بنەچەکە و رەگەزیان بۆ سەر مادەکان دەگەڕێتەوە. بەڵام هێندێک موحەقیق وزانای وەک مامۆستا مەکەنزیش هەن ، کە لەسەر ئەم باوەڕە نین .

مامۆستا مەکەنزی لە وتارێکدا کە لە ساڵی ١٩٦١ لەژێر سەردێری " رەگەکانی کوردی"یەوە بڵاوی کردۆتەوە دەنووسێ :

" کوردە نوێ یەکان زۆر بەساویلکەیی لە مێژوو، دەڕوانن ." بەو هەستەوە کە ئاتاجی باب وباپیرانێکی قارەمانن ، وئەوەی کە پادشایەتی مادەکان بێ خاوەن ماوەتەوە وایان لێ دەکا و دەیان هێنێتە سەرئەم باوەڕە تا بەبێ سێ ودوو* لێ کردن مادەکان بە باب وباپیری خۆیان دابنێن . ئەوەی راستی بێ ئەمەیە کەئێستا لەنێوان کوردەکاندا باوە تا سەرەتایەکی مێژوویی بەناوی مادی دەکار بێنن کەبریتی یە لەوەی هەژماری ٦١٢ دەخەنە سەر هەژماری ساڵی پێش میلادەوە .وئەوەش مێژووی داگیرکەرانی نەینەوایە بەدەست مادەکان . بەڵام بەپێچەوانەی ئەمتێکەڵاوی یەی هێندێک راستەقینە دەگەڵ ئەفسانەی زۆر، و بەڵگە و وێنەکانی زمانەوانی گرینگی خۆیان هەر دەمێنێ."

لە نووسەر روون نیە کە مەبەستی مامۆستا مەکەنزی لەرستەی تێکەڵاوی هێندێک راستی لەگەڵ ئەفسانە چیە؟

بۆ مامۆستا مەکەنزی وەک زمانەوانێک ئەویش کە لە روانگەی زمانەوانی بەراوردی( زبان شناسی تطبیقی) یەوە لە مێژوو دەڕوانێ . زۆر دژوارە کە بتوانێ راستەوخۆ، وڵام و بەرپرسی پرسیار یاگیرو گرفتێکی مێژوویی ، ئەویش مێژووی کورد بداتەوە وبە راشکاوی بیروڕای سۆڵێ نەکرا - وی خۆی لەم بارەوە، دەربڕێ.

مامۆستا مەکەنزی بۆئەوە ئەم راستی یە (کە مادەکان باب وباپیری کوردەکانن ) بەرێتە ژێرنیشانەی پرسیار وشک لێ کردن و پشت بە زانستی زمانەوانی خۆیەوە دەبەستێ. بەپێی رێ وشوێنی زمانەوانی بەراوردی مێژوویی ( زبان شناسی تطبیقی تاریخی) یەوە گۆڕانی مێژوویی هێندێک وشەی کوردی لەگەڵ هێندێک وشەی فارسی و بەلووچی، بەراورد دەکا و لێکی دەداتەوە، پاش ئەم بەراوردکردن ولێکدانەوەیە

دێته سەر ئەمباوەڕە :

١ـ کوردەکان لە نەتەوەی ماد نین .

٢ـ زمانی کوردی لە گۆڕانی مێژوویی خۆی دا ، کەوتۆتە کارتێ کردن(تاثیر)ی فارسی نێوەڕاستەوە

٣ـ زمانی کوردی فڕی بەسەر لکی شومالی خۆرئاوای زمانەکانی ئێرانی یەوە نیە،واتە وەک زمانی فارسی لکێک لە لکەکانی زمانەکانی جەنووبی ئێرانی یە.

بۆ بەرپەرچ دانەوەی ئەم بەشە لە بۆچوون وبڕواکانی مامۆستا مەکەنزی ،لەجێی خۆی دا بە وردی لەسەری دەڕۆین ، بەڵام پێویستە لێرەدا بەکورتی ئەوە رابگەیەنین کە:

الف ـ ئەگەر بێتووبەپێی بناغەی زمانەوانی مێژوویی بەگشتی بسەلمێندرێ ، کە زمانی کوردی ناتوانێ لە رووی گۆڕانی وپێگەیشتوویی مێژوویی ،درێژە پێ دراو و باڵا هەڵچووی زمانی مادی بێ، کە ئەمەش نە بووز دەخوا ونە دەست دەدا ،چون لەزمانی مادی چەند وشەیەک نەبێ کە لە رێی زمانی دیکەوە ئەویش بە هۆی زمانەوانی بەراوردی یەوە دەکرێ سوێندیان لەسەر بخورێ کەمادین ، هیچ شوێنەوارێکی ئەوتۆمان پێ نەگەیشتووە وبە چەند وشەی ئەوتۆش ناکرێ پیاو بێتە سەر ئەوباوەڕەی کە مامۆستا مەکەنزی هەقیەتی.

ب ـ ئەمە کوردەکان نین کە بەهۆی روانینی سافیلکا ـ نە لەمێژووی خۆیان، ساڵی داگیرکرانی نەینەوا بە دەست مادەکانیان کردبێتە بناغە بۆساڵ ژمێری خۆیان بەڵکوو لە ساڵی ١٩٣٨ ، دەستەی ئێران ناسەکان لە کۆنگرەی تەحقیقاتی ئێران ناسی لە بڕۆکسێل دا هاتنە سەر ئەم بڕوایە کە ئەم ساڵە بەبنچینەی ساڵ ژمێری ئێرانی بسەلمێنن ، بەڵام رژێمی شا بەرگری لەوەی کرد تا ئەم مێژوویە واتە ساڵی داگیرکرانی نەینەوا بە دەستی مادەکانەوەبەگوێرەی رەسمی وەک بناغەو بنەڕەت بۆساڵ ژمێری ئێرانی لەکار نەکرێ. لەنێوان زانایان و مامۆستایانی ئێرانی دا ، هەن کەسانێکی ئەوتۆ، کە ئەم ساڵە (ساڵی فەتحی نەینەوا ). بە بنەڕەتی ساڵ ژمێری ئێرانی دەزانن بۆ وێنە مامۆستائیبراهیم پوور داوود، کە مامۆستایەکی زۆربەناوبانگی ئێرانی یە لەمەر زمانەوانی مێژوویی ( زبان شناسی تاریخی )یەوە لە دیباچەی زۆر لەم کتێبانەی دا کەلە پاش ساڵی ١٩٣٨هیجری یەوە نووسیونی،مێژووی نووسینیانی بەپێی ساڵ ژمێری کوردی واتە مادی دیاری کردووە. ئەملایەک ،لەلایەکی دیکەوە نابێ ئەوە لەبیر بکەین ـ کە بەپێی ئوسلووب ورێ و شوێنی زانستی ساڵ ژمێری ـ یەوە (علم‌هیئت وتقویم) ناکرێ هەرساڵێک بکرێتە بنکەوبنەڕەت یا بنەما بۆ ساڵ ژمێر، ئەگەروانەبوایە دەبوو ساڵی دامەزرانی زنجیرەی پادشایەتی مادیان کردبایە بنەی ساڵ. پێوی مادی ـ کوردی، یاسەرەتای ساڵ ژمێری کۆچی لەجیاتی مانگی "محرم" " مانگی ربیع الاول" بوایە کە پێغەمبەری ئیسلام(د.خ.) لەو مانگەی لە مەککەوە بۆ مەدینە کۆچی فەرموو.

لەئاستی مامۆستا مەکەنزی‌یەوە، کە شک لەوە دەکا کوردەکان لەتۆرەمەو تۆوی مادەکان کەوتوونەتەوە زانایان وپسپۆرانێکی زۆری وەک مامۆستا مینۆریسکیش هەن، کەبڕوایان وایە:

پرسیاری مێژووی کوردەکان گیروگرفتی بنەچەکەی مێژوویی کوردەکان تەنیا بەوەیەوە، دەبێ وڵام بدرێتەوە ،کەکوردەکان لە تۆرەمەی " مادن " (بڕواننە بیستەمین کۆنگرەی تەحقیقاتی ئێرانی ، ١٩٣٨، بڕۆکسێل).

سەرەتای وەرزی پایز بوو. ئەو هەواڵە لە هەموو شوێنێک بڵاو ببۆوە کە ئیدارەی بارهێنان وپەروەردە مامۆستا دەنێرێتە گوندەکان تا ریشەی بێسەوادی و نەزانی خاشەبڕ کا و دێوەزمەی نەزانی ودواکەوتوویی لابەرێ.

مام رەحمان ئەم هەواڵەی لە پیرۆتی کوڕی یەکێک لە دوستەکانی خۆی بیستبوو. پیرۆت لە ئیدارە کاری دەکرد. ئەم دەنگ وباسەی لەوێ بەگوێ گەیشتبوو.

مامرەحمان تووشی مامە رەش هات وپێی گوت:

– واباشترە جێگایەک بۆ دەرس خوێندنی منداڵەکان دیاری بکەین.

مامەرەش مژێکی لە جگەرە دا وکوتی:

– دە باشە بابەخەنی بووم! گوتم دەبێ چ خەبەرێکی هێنابێ! ئەو دێ یە هەر نەبێ ٤٠ قوتابی هەیە وەک دەڵێن بۆ خوێندنیش دەبێ لە سەر کورسیلە دانیشن (سەندەڵی). ئەوەش قەت بە ئێمە جێ بەجێ نابێ!

جوامێر لێی وەجواب هات و کوتی:

– کورسی چی؟ بۆ لەسەر بەرە دانانیشن؟

مامرەحمان کوتی:

– ناخاڵەگیان دەور و زەمان گۆڕاوە ماڵت نەشێوێ ئەدی چۆن منداڵەکانمان لێ بەدعەمەل کەن!

بریاریان دا شەو لە ماڵی مامرەحمان هەموو ردێن سپی یەکان کۆ کەنەوە و جێگا بۆ مەدرەسە دیاری بکەن و تاقە میرزای ئەوێش کاک وەلی شتێک بۆ ئیدارە بنووسێ وداوای

بەگ لەم کۆبوونەوەدا بەشداری نەکردبوو.

مامرەحمان بەیانی زوو لەخەو هەستاو بە ئامینە خاتوونی خێزانی کوت:

– هەتا لەنوێژ دێمەوە نان وچایەکەم بۆ سازکە با دەفریای **شار** بکەوم.

مامرەحمان هاتەوە خێزانی نان وچای لەپێش دانا. دەستی کردبەخواردن.

مامۆستا بکاو خەڵک مۆری بکەن، بەڵێ شەو یەکێک لە خانووەکانی مامرەحمانیان بۆ مەدرەسە دیاری کرد و نووسراوەکەیان دا دەست مامرەحمان کە بیبا بۆ ئیدارە. تەنیا ئەلیاس

ئامینەخاتوون کوتی:

– ئەرێ پیاوەکە بۆوا بە تاڵۆکە نان دەخۆی خۆ تۆ هاوار نابەی؟

– کچێ کارەکەی من لە هاواریش گرینگترە.

– باشە ئێمەش بیزانین

چ دەبێ ؟
— دەنگێ مەکە ئەو جۆرەی باسی دەکەن ئەگەر وابێ بۆحەفتا پشتمان دەحەسێینەوە !
— ئاخر چیە مردووت نەمرێ نەکا ئەوشۆ ئەو گەلە خەندە*یەت لێرە خر کردبۆوە خۆت کردبێ بە کەیخودای ئەوان .

— بەڵێ دۆزیتەوە منیان کردووە بە کەیخودا بچم بۆشار لەگەڵ ئاغای مودیر قسە بکەم مامۆستامان بۆ بنێرێ .
— جا مامۆستاچ دەکا؟
— دەڵێن دەرس بە منداڵەکان دەڵێ ئێمەش

سۆران دەنێرینە مەدرەسە و پاش دوازدەساڵ بێ ئەوەی دەستی بقەڵشێ یا تووشی ناخۆشی بێ، هەموو مانگێ پووڵێکی دەدەنێ، ئەوەیە کە دەڵێم حەفتا پشتمان دەحەسێتەوە .
مامرەحمان نان وچای خوارد و بەرەوشار وەرێ کەوت هەتا گەیشتە سەر ڕێگای ماشێن هەر لەبیری مەدرەسە وپووڵ وەرگرتنی سۆران دابوو بە قەولی خۆمان هۆشی وا ڕۆیبوو گێرەی لە هەولێر* دەگەڕا لە ناکاو دەنگی ماشین ڕای چڵەکاند. سواری ماشێن بوو. لە

ڕێگابیری لەوە دەکردەوە کە ئەگەر باب و باپیری، ئەویان ناردبا مەدرەسە ئێستا تووشی ئەم هەموو ناڕاحەتی یە نەدەبوو . لە ناکاو دیتی ماشێنگەیشتە نێوشار ، دابەزی و چووە دووکانی دۆستەکەی وجێگای پیرۆتی لێ پرسی ئەویش بەناونیشان حاڵی کرد. مام ڕەحمان لە ئیدارەوەژوور، کەوت وشوێنی پیرۆتی گرت. دیتی یەوە وپێی کوت :
— کاک پیرۆت هەر وەکوو خۆت گوتبووت ئەوە ئێمە جێگای مەدرەسەمان تەرخان کردووە و ئەم نووسراوەشم هێنا تا مامۆستامان بۆ بنێرن ئیدی ڕۆژڕەشی وڕۆژباشی ئەو منداڵانەمان بەدەستی تۆیە. پیرۆت :
— بەچاوان مامڕەحمان وەرە با بڕۆین بۆ لای ڕەئیسی ئیدارە بزانین چمان پێ دەڵێ.نووسراوەکەی دا دەستی ڕەئیس.چاوێکی پێدا خشاند وکوتی :
— زۆر زەحمەتە چون مامۆستامان کەمە وگوندی وانیش زۆر دوورە هیچ مامۆستایەک ناچێ بۆوێ.
مامڕەحمان :
— قوربان گوندەکانی دەوروبەری ئێمەش مامۆستایان نیە ئەدی بۆکێهە گوندانت ناردوون . پیرۆت زۆری

قسەی رەئیس پێ ناخۆش بوو بەلاّم ئەوەندەی لەبەر پاراوە تا دەستووری دا موعەلیم بۆ ئەو دێ یە بنێرن. مامرەحمان سپاسی کاک پیرۆتی کرد و لە ئیدارە وەدەرکەوت و چۆوە دووکانی دۆستەکەی، گەیشتە دووکان وبە بابی پیرۆتی کوت :

– خۆ ئەگەر پیرۆت نەبوایە قەت کارەکەمان سەری نەدەگرت . ئێستاش دەبێ بمبوۆری کەدەردەسەریم بۆ ئێوەش سازکردووە .

– کاکە شتی وا مەفەرموو ئەوە ئەرکی سەرشانە، جا ئەگەر ئێمە شتێکمان لە دەست بێ و بۆ یەکدی نەکەین خۆ بێگانەیەک لە لاوەڕا نایە خزمەتمان پێ بکا . پاش ماوەیەک مام رەحمان ئیزنی خواست و رۆیشتەوە بۆ دێ. بەخەڵکی راگەیاند کەئەم رۆژانە موعەللیمان بۆ دەنێرن . رۆژیک خەڵک لەبەر تاوی پاییز لەبن دیواری مزگەوت خۆیان هەڵ خستبوو دیتیان ماشێنێک هات و کابرایەکی لێ دابەزی.هەموو بەرەوپیری چوون و پاش چاک وخۆشی کوتی :

– ئێستا مەدرەسەم، پێ نیشان بدەن هەتا ئەو میز و سەندەڵیانە لەوێ دانێین وجێگای خۆشم پێ بڵێن با شتومەکی خۆمی لێ دانێم. هەر وەکوو خۆیان دایان نابوو شتی مەدرەسەیان بردە ماڵی مامرەحمان و شتی موعەللیمیشیان بردە ماڵی ڕەشە. مامۆستا کوڕێکی جوان چاک و کەڵەگەت وڕوو خۆش و ناوی سوارە بوو.

بۆهەوەڵین شەو مام رەحمان سوارەی بردە ماڵێ خۆیان. خەڵکی لێ کۆ بوونەوە وهەتا درەنگایەکی هەر باسی دەرس ومەدرەسە بوو. دوایێ سوارە هاتە قسە و کوتی :

– ئێوە دەبێ شوکری خودا بکەن کەمنداڵەکانتان لە نەزانین وبێ سەوادی خەلاس دەبن، ئێمە دەبێ هەموو هەوڵ و تەقەلامان ئەوە بێ کە بەرەی داهاتوو بتوانێ متمانەی بەخۆبێ،کەموکووڕی ولاتەکەی تێ بگا، بەسە تاکەی لە هەندەران ڕا بێن و کاری ئێمە جێ بەجێ بکەن. ئێستا ئێوە بە هەوەڵین ئامانجی خۆتان گەیشتوون بەلاّم ئەوەش بزانن کە هەن حەز بەو کارەی ئێوە ناکەن چون قازانجیان کەوتۆتە خەتەر . لەدوایی ڕایگەیاند بەیانی منداڵە-کان بۆ نێونووسی بنێرن .

کاتێ رۆژ بۆوە تەواوی خەڵکی دێ لەبەر دەرکەی مەدرەسە کۆبوونەوە ، منداڵەکانیش هەر چاوەڕوانی سوارە بوون دڵیان ئۆقرەی نەدەگرت هەر هات وچۆیان بوو بەلاّم سۆرانی مام ڕەحمان لەهەموویان بە حەول تر بوو.سوارە پەیدا بوو منداڵەکانی بردە ژوور پاش ناونووسی ناوی باوکی دەپرسین ،کوڕی ڕەشە ،کوڕی مامرەحمان، کوڕی عەلی شەلە وکوڕی...وکوڕی.......

سوارە دەستی کرد بە قسەکردن.منداڵەکان ئەوجۆرە قسەیان لەدایک وبابیان گوێ لێ نەببوو پاش تەواو

بوونی قسەکانی دەرسی یەکەمی پێ گوتن .

سێ مانگ لە خوێندن ڕابردبوو سۆرانی کوڕی مامڕەحمان ناوبانگی دەرس خوێندن وئازایەتی بەگوێی هەموو کەس گەیشت . یەک دەیکوت دەبێ بەمەهەندیس ئەوی دی دەیکوت دەبێ بە دوکتۆرو.. ئیدی مامڕەحمان لەشایان وەختابوو ناوی خۆی لەبیر بچێتەوە، غەمو پەژارەی نەما ،بیری لەوە دەکردەوە پاش ئەوەی سۆران لە دێ دەرسی خەڵاس بوو دەبێ بچێتە شار. ئاواتی مامڕەحمان زۆر قووڵ ودرێژ بوو بەڵام نەیدەزانی کە ڕۆژگار چلۆن پیلان دەگێڕێ.

ڕۆژێک کوری عەلیەشەل لەمەدرەسە هاتەوە و بە بابی کوت :

— بابە ئەورۆ موعەللیم قسەی زۆر سەیری دەکرد.

— ڕۆڵە بڵێ بزانم چی دەکوت .

ـدەیگوت‌ئێوە بەرەی داهاتووی وڵاتن دەبێ وشیار بن و نەهێڵن ئەوکەسانەی کە حەز ناکەن ئێوە وشیار بنەوە، لێکتان کەن و بە ناوی عیلمی کافران لەخوێندنتان کەن تا بە هاسانی بتاندۆشن.

عەلیەشەل ڕاستەوخۆ ڕۆیشت بولای ئەلیاس بەگ و شتەکەی بۆگێراوەئەلیاس بەگ پێی کوت :

— ئەوشۆ خەڵک کۆکەوە و بییان هێنەگوندی ئەگرە بۆماڵی ئێمە. عەلیەشەل بە خەڵکی ڕاگەیاندو شەو هەموو بەرەوماڵێ ئەلیاس بەگ وەڕێ کەوتن لەڕێگا هەریەکەی فکرێکی دەکردەوە دەبێ کار چ بێ، دەبێ بۆ جۆماڵێ مان بەرێ یادەیەوێ دیسان زەوی وزارەکەمان داگیر بکا ،کاری وی یا بێگارە یا لێدان ودەست بەسەردا گرتن. گەیشتنە ماڵی ئەلیاس بەگ بێ ئەوەی بەخێرهاتنیان بکا رووی تێکردن و کوتی :

— دەزانن بۆ بانگم کردوون ؟

— ناوەڵڵا، ئەلیاس بەگ.

— ڕۆڵە ئێمەهەموومان موسوڵمانین وبرای یەکدین ئەوانە پێیان خۆشە ئێمە منداڵەکانمان کافر بن وەرن دەست لەو شتە بۆ جێیانە هەڵگرن.

مامڕەحمان هاواری کرد و کوتی : —

— ئەلیاس بەگ مەبەستت چیە ؟

وڵامی مامڕەحمانی نەداوە و درێژەی بەقسەکانی دا، برایان ئەوە بوو پێم‌کوتن ئیدی خۆتان دەزانن.

خەڵکی دێ بڵاوەیان کرد .مامڕەحمان دیسان کەوتە بیرکردنەوە .ئەرێ خوایە بڵێی زەحمەت‌بەخەسارنەبم کوڕەکەم لەخوێندن نەکەن و....

دوای چەند ڕۆژ ماشینێک پرلە ژاندەرمەی شاهەنشاهی هاتنە بەردەرگای مەدرەسە وکاک **سوارە**یان لە کەلاس هێنادەر. سواری ماشێنیان کرد و بردیان. سوارەمان نەدیتەوە.

# ئێمە و خوێنەر

تکا لەخوێنەرانی بەڕێزی سروە دەکەین ئەم خاڵانەی خوارەوە لەبەرچاو بگرن :

١- نووسراوەکان بە خەتێکی خۆش بنووسن وا بێ بۆ خوێندنەوەی تووشی گیروگرفت نەبین .

٢- لە دیوێکی کاغەز بنووسن .

٣- ناونیشانی خۆتان تەواو بنووسن تا وەڵامی نامەکانتان بە دەست بگاتەوە .

٤- ئەگەر بابەتی وەرگەڕاومان بۆ دەنێرن، ئەسڵەکەشی بۆ بەراورد و هەڵسەنگاندن بۆ ئەم ناوەندە، بنێرن .

٥- ئەگەر دەگونجێ نووسراوەکان لە دوو یا سێ لاپەرەی گۆوارەکە پتر نەبێ بۆئەوە جێگە بۆهەموو بابەتێک ئاواڵە بێ .

٦- دەستەی نووسەرانی سروە وەک گۆوارێکی فەرهەنگی- ئەدەبی دەتوانێ لەباری رێنووس ورێزمانەوە دەست لە نووسراوەکان وەربدا .

٧- ئەو بابەتانەی بۆ ئێمەی دەنێرن لەبابەگانی-دا هەڵدەگیرێ و نادرێتەوە بەخاوەنی .تکایە نوسخەیەک لای خۆتان رابگرن .

دەستەی نووسەرای سروە

بۆکان: **عەبدوڵڵا خوسرەوزادە**

ئەم شیعرەی بەناوی شین گێڕی بۆت ناردبووین بەداخەوە درەنگ گەیشتێ و نەمانتوانی لە سروەدا، بیگونجێنین . چاوەڕوانی دیاری نوێین .

بۆکان: **نادرمستەفازادە**

ناساندنی مەڵبەندی شام راستەباسێکی مێژوویی نیەکەسیش نالێ مێژوویی یە نووسەر دەڵێ دەبێ زۆرتر باسی ئەم ناوچانە بکرێ کە لەباری مێژوویی و جوغرافیایی یەوە نەناسراون شام لەباری جوغرافیایی یەوە جێگا وشوێنەکەی دیاری کراوە حەسیر وبۆری چنین لە فەرهەنگی کوردیدا هەیە باسی راو لە شام باری ئاپووریشی لەبەرچاوە . هەڵبەت ئەوە بەم مانایە نیە کە وتارەکە بێ عەیبە بەڵام لەسەر ئەوەشەوە بە بڕوای ئێمە ناسینی ناوچە جۆربەجۆرەکانی کوردستان پێویستە

مەهاباد: **جەماڵ شێخـــەل- ئیسلامی**

نامە وجەدوەلەکەت گەیشتێ، بەڵام وەختی بەسەر چووبوو نەمانتوانی لە قورعەدا بەشداری بدەین .

چاوەڕوانی هاوکاری پتری ئێوەی بەڕێزین .

بۆکان: **محەممەد سولەیمان پوور**

لە جەدوەلدا نووسراوە گوندێکی شنۆ. هێندێک وشەی کورت هەن لە هەموو زمانێک وهەموو جەدوەلێکدا زۆر دەکار دەکرێن. ئەوەش هۆی رێ ون کردن لە خوێنەر نیە. لە جەدوەلی فارسیدا نووسراوە بۆوینە: مەڵبەندێکی فەقیرنشین لە شاری نیویۆرک . ئایا لە هەزار کەس کە جەدوەلی حەڵ دەکا چواری ئەم مەڵبەندە دەناسێ؟ ئەمجار ئەم وشەی گوندی شنۆ دوو پیتە ئەگەر راست و چەپەکەی ببینیتەوە هاسان

بۆت حەلّ دەکرێ .

لەرێزی یازدەشدا لە بیرمان چووە چاوەیەک رەش بکەینەوە. دەمانبوورن .

میاندواو :ئەحمەدکەریم‌نیژاد

لە بابەت پرسیاری هەوەڵت دەڵێین کە: هۆی تورکی بوونی ناوی هێندێک لە گوندەکانی کوردستان ئەوەیە کە ، لە نێوان دەوڵەتی عوسمانی ودەوڵەتی ئێران هەمیشە شەر وکێشە بووە وهەریەکە ویستوویەتی ناوچەی ئێستای کوردستان بەئی خۆی بزانێ . جا ئەودەم کە لەژێر دەستەڵاتی دەوڵەتی عوسمانی دابووە ئەم ناوە تورکی یانەیان لەسەر ناوە.

لەلایەکی دیکەوە هێرشی مەغوول بۆناوچە وجیرانەتی لەگەڵ شقاق وشاسەیوان و قەرەپەپاخ لەم بەینەدا شوێنی خۆی داناوە بە تایبەتی لەناوچەی شامات

پرسیاری دووهەم کە پاشگری "یان"ە بەم دوو شێوەیە کە نووسیوتە هەر دووک راستن هۆی ئەمە کە دەبینی دوو"ی" دەنووسرێ ئەوە کە پاشگرەکە هەمان "یان"ە بەلام وشەکە بۆخۆی "ی"ی‌هەیە وەک یارمەتی پیاوەتی دەنا وشەی پیاو یار، پیاویان ، یاریان دەنووسرێ. مەبەست تەنیا ئەوەیە کە هەردووک "ی" بنووسرێ جا چ بەسەر یەکەوە بێ و چ لێک جودا بێ .

پرسیاری سێهەم:بەتە مایین رێزمانی کوردی بەرە بەرە لەسروەدا بگونجێنین . خوا یاربێ لە ژمارەکانی داهاتوودا دەیبینی .

نەغەدە :دیاری غەفووری

نووسراوەکەت بنێرە . دەیدەین بە دەستەی نووسەران رای لەسەر بدا. ئەگەر پەسند کرا چاپی دەکەین .

لەبابەت رێنوێنی یە کانیشت زۆر سپاس دەکەین .

بۆکان: رەحیم عەزیزی

بەشەکانی دیکەی وتارەکەت‌بنێرە تا سەرجەم رای لەسەر بدرێ. ئەم وتارانەی باست کردوون بیانێرە ئەگەر پەسند بوون بۆ چاپ ئامادە دەکرێن .

نەغەدە : کامران عەبدوڵڵا

بەشەکانی دیکەی چیرۆکە کەت بنێرە با دەستەی نووسەران سەرجەم رای لە سەر بداوئەگەر پەسندی کرد چاپی بکەین .

پیرانشار: مەلا جەلال

ژیاننامەی مامۆستا هێمن لە زمانی خۆیەوە پێشەکی تاریک و روونە و بەناوی "لە کوێوە بۆکوێ " دەتوانی چاوی لێ بکەی

نامە ودیاری ئەم ئازیزانەشمان بەدەست گەیشتووە .سپاسیان دەکەین .

تاران: عەزیز وەحیدی
: عەزیز حەسەنخاڵی
سنە : حەمەحەسەن ئەمین
شنو : سەردار سەدیقی
سەقز : زاهید کازمی
خانێ : مستەفاکەدخودا
شنۆ : مامەند خزری
بوکان: قادر ئازمەند
بانە : سەلام محەممەدپوور
سەقز : حەسەن ئەمین پوور
.... : م.ج. عەباسی
کامیاران: ساڵح گێلاسی
مەهاباد : فەرهادجیهان‌میهەن
مەریوان: جەلیل عەباسی
نەغەدە : بەدرەدین ئیسقێلی
میاندواو: حوسێن رەحیمی
مەهاباد: ع . بێزار
شنۆ: حاسڵ قادری
بۆکان: سابیر مووسی زادە
تەورێز :سەیدکەماڵ‌لەتیفی
جەڵدیان: ئیبراهیم‌پیرۆتی
مەهاباد: سمایل بەزاز
بۆکان:مەجید عەرەبی
شنۆ: کەیفی برادۆستی
نەغەدە: ئیبراهیم‌پیرۆتی
بۆکان:عومەر باپیری
خانێ :عوسمان مستەفا پوور
بۆکان:شەریف عەرەبی
سنە : فەرزین ئەسەدی
بانە: عەلی حوسێنی
نۆدشە :جەلال‌عەبدی پوور
مەهاباد :سەیدعەبدوڵڵاسەمەدی
تاران: خدر فەڵڵاح
بۆکان: عومەر مەولوودی

ئایا ئەمووەیسەی کەبە درێژایی ساڵ هەزاران کەس لەخەڵکی کوردستان دەچنە زیارەتی، وەیسەلقەرەنی رێ رەوی پێغەمبەری خوا (د ـ خ) وخۆشەویستی ئەوزاتەیە؟

لەنێو خەڵکی کوردستانا برێک بیروباوەڕ هەن کە جێگای باس ولێکوڵینەوەن. لە کوردستان مەرقەدی دەیان پێغەمبەر وئەسحابەو پیاو چاک وشێخ هەیە کەزیارەتگای خەڵکی موسوڵمانی کوردن. بۆوێنە مەرقەدی دووکەس لەو پیاوچاکانە لەقورئانی پیرۆز ـ دا ناویان هەیە کەلە کوردستانی عێراقن یەکیان **حەزرەتی زەکەریایە** (د ـ خ) و ئەوی دیکە **حەزرەتی یونس** (د ـ خ) جیالەوە چەندین ئیمامزادەی وەکوو: **کۆسەی هەجیج** (ئیمامزادە عەبدوڵڵا برای ئیمامڕەزا) ئیمامزادە **پیرعومەریسنە** و ... هەن کەهەموویان زیارتگای خەڵکن ورۆژتا ئێوارێ پۆل پۆل بەنەزر ونیاوەوە دەچن بۆ زیارتی ئەوپیاوچاکانە.

یەکێک لەو پیاوەگەورانەی ئیسلامکە مەرقەدی لەکوردستانی ئێرانە **حەزرەتی وەیسە**کە ساڵی نەک دەیان هەزارکەس ژن وپیاو پیرولاو زیارەتی دەکەن بەڵکوولە فۆلکلۆرو فەرهەنگی گەلی کورد دا جێگای تایبەتی هەیە. لە گۆرانی دا زۆرجار ناوی دەبیسترێ وەکوو:

**بابچینەسەروەیس بەتۆبەکاری**
**تۆبەلەگشتی غەیری دڵداری**
**بابچینەسەروەیس وەیسی خۆمانە**
**بپرسین لەوەیس خەتای کامانە**
**بابچینەسەروەیس بلاڵێینەوە**
**خەرمانێ لەگوڵ بماڵینەوە**

"وەیس کێ بووە"

حەزرەتی وەیسەلقەرەنی لەپیاوچاکانی سەرەتای ئیسلام وهاوزەمانی پێغەمبەر (د ـ خ) بووە. سەبارەت بەوە کەموسوڵمان بووەکەس هیچی نەگوتووەبەلام **شێخ فەریدەدینی عەتارنیشا بووری** لەکتێبی گەورەی خۆی بەناوی (**تذکرە الاولیا** دا نووسیویە کە **حەزرەتی محەممەد** (د ـ خ) جار جار رووی دە ناوچەی **قەرەن** دەکرد دەیفەرموو بۆنی خوشیوەیسم بۆ دێ وەک نووسراوە حەزرەتی **وەیس** وشترەوان بووە وزۆرترخەریکی زیکروتاعەتی خوا بووەهەربە وشترەوانی نانی بۆدایکە پیرەکەی پەیداکردووەئاواتی گەورەی زیارەتی پێغەمبەر (د ـ خ) بووەبەلام چۆن دایکی بەتەنیابووە بەئاواتی

# وەیسەلقەرەنی
# وەیسەلقەرەنی

«عومەر فاروقی»

خۆی نەگەیشتووە . ئەوەئەرک و قەدری دایک لەئیسلام دا ، دەردەخا ، رەزای دایک وباب لەتاعەت باشترە دەنوێنێ .

بەپێی نووسراوەکەی عەتارو گێرانەوەی دەماودەم، جارێک وەیس بۆزیارەتی پێغەمبەر ( دخ) دەچێتە مەدینە بەڵام حەزرەت (دخ) لەماڵ دەبێ. وەیس بەرەوماڵ وەرێ دەکەوێ پێغەمبەر (دخ) بەرێگایەکی دیکەدا دەچێتە مزگەوت،کاتێک وەیس بەخزمەت **ئایشە** دەگاو خەبەری چوونە مزگەوتی حەزرەت (دخ) دەبیسێ داوای ئاودەکا ئایشە لەگلێنەدا ئاوی بۆ دێنێ وچەند قوم دەخواتەوە. چون دایکی تەنیا بوو وشترەکانی بێ خاوەن لەمەزرا مابوونەوە مەدینەی بەجێ هێشت . حەزرەتی محەممەد (دخ) کەدەزانێ دێتەوە ماڵێ حەزرەتی ئایشە چۆنەتی هاتنەکەی بۆدەگێرێتەوە پێغەمبەر (دخ) دەفەرموێ گلێنەکەم بۆبێنە تادەم بەجێ زارەوە بنێم و ..... بەڵێ وەیس پیاوێکی ئەوا بوو حەزرەت (دخ) پێش ئەوەی ، ئەوزاتە ببینێ زۆری خۆش دەو- یست بەچەشنێک کەوەسیەتی فەرمووپاش مردنی عەباکەی بدەن بەوەیس. عەتار دەنووسێ: پاش وەفاتی **حەزرەتی محەممەد** (دخ) دووکەس لەنزیکانی واتە **حەزرەتی عەلی** و (دخ) و **حەزرەتی عومەر** (دخ) عەباکەیان لەسەر وەسیەتی پێغەمبەر بۆوەیس برد ، جا چون وەیس پێغەمبەری نەدیوە بەئەسحابە ناناسرێ بەڵام چون خەلیفەی دیوە بە رێ رەوی ئیسلام ناودارە .

" مەرقەدی وەیس"

ئەوجێگایەی بەمەرقەدی حەزرەتی وەیس ناوی دەرکردووە کەوتۆتە بەینی **ماهیدەشت** و **رەوانسەروکرماشان** لەبەینی کامیاران و کرماشان لەسەر کێوێکی بڵیند گومبەزەکەی دیارە ،لەشێوەی گومبەزەکە وا دەردەکەوێ کەلەدەورەی حکومەتی سلجوقیەکاندا دروست کراوە . جا روون نیەبەرلە وان شێوەی مەزارەکە چۆن بووە بەڵام هەرلە سەرەتاوەکە تەرمی حەزرەتی وەیس لەوی نێژراوە دەوروبەری کراوەبە قەبرستان . ئێستا خەڵک لە هەمووشارەکوردنشینەکانەوەبۆ زیارەت رووی تێدەکەن بە تایبەتی بەهاروپاییزو هاوینان دەروێشەکانی کامیاران وهەورامانیش کۆری زکروتەلیلەلەدەوری مەرقە- دەکەی دەگرن چەند ساڵ پێش دەوڵەت بۆئاسوودەیی ئە و کەسانەی دەچن بۆ زیارەت رێگایەکی ماشین رەوی لێدا بەڵام کێوەکە هێندبەرزە لە کاتی سەرکەوتن دا خەڵک دەترسێن .

"ئایا ئەمەوەیسی قەرەنە ؟"

تائێستا سەبارەت بەوەیس زۆرباس کراوە هێندێک پێیان وایە ئەوحەزرەتی وەیسە لقەرەنەی کەباسمان کرد ئەونیەچون ئەو لە**حیجاز** لە نزیک مەدینەبووە ئەدی چۆنە گەیشتۆتە ئێرە ؟

بەڵام بەبروای من ئەم مەزارە گڵکوی حەزرەتی وەیسە ئەویش بەودەلیلەکە :

سەبارەت بەوەفاتی فەریدەدین عەتاری نیشابووری دەنووسێ **وەیس** لەبەرەبەری کۆتایی ژیان هاورێی**حەزرەتی عەلی**(د-خ) بووە تالەشەڕی (**سەفین**)دا شەهید کراوەو تەرمی لەشنزارەکانی یەمەن نێژراوە ، گۆڕەکەی لیم وزیخی بەسەرکشاوە بەچەشنێک کە دیارنیەا جێگای سەرسورمانە چۆن شەڕی (**سەفین**) . لە نێوان **حەزرەتی عەلی** (د-خ) و **معاویە**دا لە خاکی ئێراق کراوە ،چۆن لەوکاتەداتەرمیان بردووە بۆیەمەن؟ بەبروای من چون وەیس خۆشەویستی پێغەمبەر ( د-خ) **وحەزرەتی عەلی** ( د-خ) بووە هێناویانە -تەوە **ماهیدەشت و** ئەویش نزیکترەلەیەمەن . خۆئەو زەمان فرۆکە وماشێن نەبووە جالەبەر ئەوە مردوویان لە نزیکترین جێگا ناشتووە **دەبێ خەڵک متمانە بکەن کە بۆ زیارەتی وەیس زحمەت بە خەسار نین وئەووەیسەی ئێمە دەڵێین خۆیەتی.**

# گیر و گرفتی شارەکان

قازی-ئەحمەد

رەنگە هەموو شارێک لەپێشدا گوندێک بووبێ کە بەرە بەرە گەورە بۆتەوە و پەلی هاویشتووە و بۆتە شارۆچکە وپاشان بە زەو زووی نێوخۆو هورووژمی خەڵکی دەوروبەر گەورەتر بۆتەوە و ناوی شاری بەسەر خۆدا سەپاندووە .

کۆمەڵگای ژیانی ئادەمیزاد هەتا لە قەوارەی گونددا بمێنێتەوە بە بەشێکی تەبیعەت دادەندرێ. چونکە لە دێدا کارخانە و کارگا و تڕافیک نیە کە ئاوو هەوا ئالوودە بکەن وپیساوی ماڵەکانیش ئەوەندە نیە کە چۆم و رووبار بە جارێک لە کەلک بخا و ژیانی زیندەوەرەی یان تێدا لەنێو بەرێ. ئەو پیس وپۆخڵی یە ی دانیشتووان پێکی دێنن بە بارانێکی بە غوڕەم وبایەکی توند دەشۆرێتەوە و لادەچێ.

ئەگەر پلەی فەرهەنگی ژیانی دانیشتووانی گوند لە سەرەوە بێ، ئەوەندە زبڵ و زاڵەش دەشاردرێتەوە ومەڵبەندی گوند هەمیشە پاک و خاوێن دەمێنێتەوە .

کە دێینە سەرباسی شار مەسەلەکە دەگۆڕی وزۆر لکی تازەی لێ دەبێتەوە . وڵاتە پێشکەوتووەکان بەرنامەی زانستی یان بۆ شار سازی ئامادە کردووە و نیاز و پێداویستی گەڕەکە ماڵەکان لە ژێر زەوی و سەرزەوی و هەوا ـ دا بۆدەیان ساڵی دواتریش وەبەرچاو گیراوە تابەرەکانی داهاتوو تووشی هەڵکەو ڵ هەڵکۆڵ ورووخاندن وسازکرد ـ نەوە نەبن وهێزو دراوی زیادی لەکیس نەدەن وئابووری وڵات زەرەری وێ نەکەوێ .

لە شارەکانی ئێمەدا ، ئەگەر ئەمڕۆ شەقامێک قیرەنوا بکەن،سۆزی موخابەرات یا شارەداری یا ئیدارەیەکی تر بۆکێشانی سیم و لوولە قیلەتاوەکە هەڵدەکەننەوە. . ئەم دەردەسەری یانە هەموو بەرهەمی کەمتەرخەمی وبێ بەرنامەیین کەدەبێ فیکرێکی بنەڕەتی یان بۆ بکرێتەوە.

دیمەنێکی ناشیرینی زوربەی شارەکانی ئێمە رائەنگاوتنی تەلی کارەبایە کە وەک تاڵی جاڵجاڵووکە تێک بەزیون و دیمەنی حەوای شارەکانیان دزێو کردووە. زۆرجار بازاڕو قەیسەری بەهۆی ئاور لێ بوونەوەی سیمەکان سووتاون و کلوور کلوور کووتاڵ و پارچەیان کردۆتە خەڵووز وبە سەدان ماڵ تێداچوون ومافنگی ماونەوە .

زوربەی شارەکانی کوردستان کەوتوونە نێو چیاکان و لە دەشتایی بەرتەسک و پاناوکی رازو رەوەزدا بنیاتنراون .

ئەم بەرتەسکی وتەنگە بەری یە بۆتە هۆی داتەپاوی ورێک کوشرانی کۆمەلگاکان وگیروگرفتی زۆرو زەبەندی شارەداری وشارەوانی وخەلک. رێگاوبان لەم تەرزەشارانەدا زۆر تەنگ وباریکن.کۆلانەکان بەتایبەتی لەبەشە کۆنەکانی شاردا زۆر تەنگ وبەرتەسکن . رەنگە لە ئەدەبی هیچ نەتەوەیەکدا مەزمونی کۆلانی تەنگ بەقەدەر ئەدەبی کوردی نەبووبێ بە هەوێنی شیعر و فۆلکلۆر . گۆرانی بێژی کورد دەلێ : هەی لە کۆلانی تەنگ شان مەدە لەشانم! هەی نەشمیلەی چاوکال تۆ سووتانتگیانم !

کوچەی کرماشان تەنگ و تاریکە

یارێکی تێدا کەمەر باریکە

بەو نیسبەتە کە کۆلان باریک، وتەنگن، خانووەکانیش پێوانەیان کەمە وژوورەکانیان چووک وحەوش و حەساریان بەرتەنگن .

لەزۆر شاران بەهۆی نەبوونی زەوی گەرەکە مال کەوتوونە لاپال و تەفاوەتی بلیندایی ئەمسەر و ئەوسەری کۆلانێکی کیلۆمەتری جاری وایە دەگاتە سەتگەز ! ئەم جۆرە گەرەکانە

بەتایبەتی لە شنۆ، سەقز و بانە و سنە و هەورامان و مەهاباددا دیاردەیەکی بەرچاون .

تەنگەبەری مەودای شارو کەلەکەبوونی خانووبەرەکان لەسەر یەکتر و هوروژمی لە ئەندازەبەدەری خەلکی گوندەکان، ژیانێکی پالەستۆیی پرلە سمرِ سمرِی لە شارەکاندا پێک هێناوە. لە زۆر جێگا رێی رێدار نیە و شەقامی تەنگ و کۆلانی،باریک هێزی کێشان ورێدانی جەماوەری خەلکی نیە . لێرەدایە کە زاراوەی "جێمکە تا رێت کەم" وەراستگەراوە .

هەرشارێک چ لە کوردستان و چ لە جێگای دیکە تەنگ و چەلەمە وگیروگرفتی خۆی هەیە ئێمە لەم وتارەدا لە روانگەیەکی تایبەتی یەوە تەماشای شاری مەهاباد دەکەین .

ئەمشارە ژێکەلانەیە کەوتۆتە جنووبی گۆلی ورمێ و لە دەشتێکی بەرتەسکداکە چەند رشتەکێو دەوری داوە ، دروستکراوە .تەمەنی ئەم شارە لە ٤٠٠ سال تێ ناپەرێ. لەم ماوەیەدا شار بەلای زۆر بەسەر هاتووە ونەیتوانیوە زۆر گەورە بێتەوە و لە بازرگانی وسەنعەتدا پێشکەوێ. دەولەتی رووسیای تەزاری لە شەرِی یەکەمی جیهانیدا شاری سووتاند وخەلکەکەشی قەتل و عام کرد. وەک مێژوونووس دەگێرنەوە زیاترلە ٨٠٠٠ کەس لەوشارەدا کوژراون. پاش ئەو رووداوە دلتەزێنە چەن جاری دیکەش شار لە لایەن عەشیرەتانەوە تالان کراوەو زۆر جاریش سێلاو وسووتمانی تێدا رووداوە. لەم سالانەی دوایی‌دا پاش ئال وگۆرِی سیاسی وئابووری و زۆربوونی دانیشتووانی ولاتشاری

مەهاباديش وەک هەموو شارەکانی دیکەی ئێران لەبەر یەکشاوەتەوە و ژمارەی دانیشتووانی چەن هێندی جارانی لێهاتووە.

لەم گەورەبوونەوەو پەل و پۆ هاویشتنەدایە کە شار تووشی زۆر گیر و گرفتی تایبەتی دەبێ کە پاشان هەرچی دەکا بۆی جێ بەجێ ناکرێ.

هەموو شارێک مەسەلەی بەرق وئاوو ساختمانی هەیە. مەهاباديش وەک هەموو شارەکانی دیکە لەم گیر و گرفتانە بێ بەش نیە. بەلام ئەمشارە مەسەلەیەکی تایبەتی خۆی هەیە کە زۆر شاری دیکە نیانە ئەویش مەسەلەی چۆمی مەهابادە.

ئەم چۆمە لە جنووبی غەربی وجنووبی مەهابادەوە بەتایبەتی لە ناوچەی مەنگوڕانرا سەرچاوە دەگرێ و لە گۆشەی جنووبی رۆژئاواوە دەکەوێتە قەراخ شار، کە لێرەدا بەربەستی مەهاباد لێدراوە ودەریاچەیەکی زۆر جوان ودڵ بزوێنی پێک هێناوە کە بۆ خەلکی شار و ناوچە جێگەی سەیاحەت وگەڕان وحەسانەوەی رۆژانی هەینی و بێکارییە .پاش ئەوبەربەستە چۆم وردە ،وردە لەشیوێکی غەربی ـ شەرقی دەکەوێ و بە قەراخ شاردا تێدەپەڕێ و دیسان پێچ دەخواودەکەوێتەوە شوێنی جنووبی-شیمالی و دەگاتە دەشتی شارویران و یەک راست بەرەو بەحری ورمێ خۆدەکوتێ.

لە رابردوودا ئەو بەشە کە کەوتۆتە نێوشار جێگەی پیاسەی ئێوارانی خەلکی شار بوو. قەراغەکانیَ دەکرا بە بێستان وسەوزیخانەو باغ و باغاتی جوان دەوری گرتبوو. لوولەکێشی نەکرابوو ئاوی مزگەوتەکان و مالەکان لە کەرێزەوکانی وچالاوان دابین دەکرا وئاوی خواردنەوەش بە گۆزەوبارەبەری ئاوکێشان لە چۆمەوە بۆمالان دەچوو. چۆمەکە روون و جوان بوو. لەبەر زولالی و خاوێنی تەختی بنی دیار بوو وپڕ بوو لە قاشە ماسی وباقۆ(نەقە)

مەهابادوشارەکانی تری کوردستان سیستمی ئاوەرۆیان هەیە کەبەداخەوە گەنداوە ـ کانیان دەرژێتە ئەو چۆم و رووبارانەی کە بەنێو شار یا قەراخ شاردا تێدەپەرێ.

زەمانێک کە شاری مەهاباد چکۆلە بوو گەنداوی رەهەند و خرەکان ئەو ئەندازە نەبوو کە چۆمەکە ئالوودە وشلوێ بکا چونکە ئەو گەنداوانە زیاتر بۆ ئاوداشتنی سەوزیخانە وبێستانەکان هەلدەبەستران ونەدەگەیشتنە- وە نێوچۆم.ئەو سەردەمە شار وسەتان چەشنە گیان لەبەری دیکەکە لەئاودادەژین. من خۆم زۆرجار رەوەی نەقەم تێدا دیوە کە ئێواران بۆ راو دەگەڕان و ئەو چۆمەیان دەڕازاندەوە. قاشەی چۆمی مەهاباد بەناوبانگ بوو. باغات ومێشەکانی قەراغ چۆم پڕبوون لە باڵندەی جوان و جۆراوجۆر کەبە هەزار چەشنە ئاهەنگ سەمفۆنی ژیانی ساکار وجوانی شارەکەیان پێک دێنا. بۆ هەرلایە رۆیشتبای تووشی تەبیعەتی ساغ ودەستلێ نەدراو دەبووی.

ئینسان وتەبیعەت وەک مندالْ ودایک لێک هەڵاوون و هەریەکە خۆشی وبەختەوەری خۆی لە تەڕوپاراوی لایەنەکەی دیکەدا دەدی .

پاش شەڕی دووەمی جیهانی وهاتنی ماشێن و کارەبا بۆ شار،وردە وردە شار گەورە بۆوە وگەڕەکە مالّی تازە لە هەموو سووچێکەوە سەریان هەلّدا . بەتایبەتی لەوسالانەی دواییدا پاش شۆڕشی ئیسلامی ئێران شار بەهەلّپە ژمارەی نفووسی گەیشتە دووهێندەی جاران .ئەو ئالّ وگۆڕە بوو بەهۆی زۆربوونی گەنداوەکان ولە دەیان جێگاوە ئاوەڕۆی دەرژێتە نێو چۆمەکەوە کە نەوت وچەورایی و مەوادی شیمیایی وپیسایی و هەزار چەشنە میکرۆب وماکەی نەخۆشی دەڕژێنێتە نێو چۆم و ئاوەکەی ئالوودە دەکا .

ئەم چۆمە جوانە کە زەمانێک لەبەر روونی وزولالّی دەتگوت چاوی قرژالّە ئێستا لیخناوێکی رەنگ تالّە کە لە جیاتی نەقە وقاشەماسی وگیاندارە جوانەکانی نێو ئاو پڕە لە کیسەنایلۆن و تەنەکەوقوتووی بەتالّ و ژەنگاوی وتوێلکەی میوەو زبلّ وزالّی دیکە کەبێزت نایە چاوی لێ بکەی. ئەو قەراغ چۆمەی کە زەمانی مندالّیم بۆنی هەزار چەشنە گولّ وگیای لێدەهات ئێستا لەبەر بۆگەن وبۆترشاوو بۆهەڕنە ـ هووت وبۆگەنی شارستانەتی ! " ناوێری رووی تێ بکەیْ .

ماسی وبالّندە ئاسەواریان بڕاوە.لە زۆر جێگا زبلّ و زالّی شاریان بەکامیۆن رشتۆتە نێو چۆمەکە و ژەهراوی ئەم زبلّ وزالّە ژیانی هەموو گیان لەبەرێکی خستۆتە مەترسی یەوە .

مەترسی کەورەتر ئەوەیە کە زوربەی گوندەکانی شارویران وەک خانەگێ، وسوو کەند ، قونقەلا، ئیندرقاش ، دارەلەک،گوێک تەپە ، لەج قزلّقۆپی و... کە زۆربەیان شارەدێن وجەماوەرێکی زۆریان تێدا دەژی لە ئاوی ئەو چۆمە دەخۆنەوە ،شیوی پێدەکەن وئاژەلّی لێ ئاو دەدەن. هەر ئەوەش بۆتە هۆی تەنەوەی زۆر نەخۆشی لە ناوچە وەک : تەبی مالّت ، نەخۆشی پێستی ،

زگچوون و زۆرچەشنە نەخۆشی دیکە کە لە خواردنەوە و دەکارکردنی ئاوی پیس پەیدا دەبێ .

بۆچارەسەرکردنی ئەم گرفتە کۆمەلایەتی یە شارەداری مەهاباد زۆر بە ئاسانی دەتوانێ بەکانالێک ئاوی چۆم وگەنداوەکان لێک هەلّبڕێ و پێشی ئەو هەموو زەرو زیانە

ده وەتەبیعەت وشارستانەتی دەکەوێ بگرێ. لە ولاتانی پێشکەوتوو گەنداوەکانی شار لە جێگای خۆیدا دەپالێون وچەن چەشنە بەرهەمی بەکەلکی وەک ئوورەو ئامونیاک وکوودوشتی دیکە لێ وەدەست دەخەن وئاوەکە بەخاوێنی دەگێڕنەوەنێو چۆم و رووبار .

# ئاشى ئاوى

هەوەڵ شتی پێویست بۆ **ئاشی ئاوێ** وەکی لەناوەکەی رادیارە "**ئاوە**"ئاوی ئەو ئاشە لەدووسەرچاوەڕاوەدەست دێ

**ء ـ بەندی لەچۆمەوە بۆ هەڵدەبەسترێ**

**ب ـ لەکانیاوی پڕئاو کەڵک وەردەگیرێ**

**تێبینی (۱)** : ئاش دەبێ لەجۆگەبەرەژێربێ یانی جۆگەی ئاش بەسەریدانێر بێ

**تێبینی (۲)** :ئەوەندەئاوەی دەتوانێ ئاشی پێ بگەڕێ "**ئاشگێر**"ی پێدەڵێن .

**تێبینی(۳)**: ئەوجێگایەی ئاودەڕژێتە نێو **دۆڵاش** ، **حەوالەی**پێدەڵێن .

دۆڵاش (دۆڵ ئاش) : دارێکی ئەستوورە . درێژایی یەکەی بەجێگە دەگۆڕێ . نێوی ئەم دارە دۆڵ دەکرێ یادەکۆڵدرێ یانی دۆڵاش جۆگەلەی دارە ...

**تێبینی (۴)**: لەسەرحەوالە چوارپێنج داردەجۆگەدەچەقێنن بۆگێڕانەوەی خشت وخاڵ، کە پێی دەڵێن **سپەرە** .

ئاو کەبەدۆڵاشدا هاتەخوار یەکسەر **وە پەڕەی ئاش** دەکەوێ کەپێی دەڵێن**تەمبوو** .

**تێبینی(۵)**: پەڕەی ئاش لەتۆپی دارچەقیون ئەو ئاوە، که وەتەمبوو دەکەوێ بە دۆزەقە دادەچێتەدەر . **تەمبوو** بە ئاسنێکی درێژەوە بەستراوە کە شەش سانت ئەستوورە . بەوئاسنەدەڵێن " **بستە** ".

**بستە**لەژێرەوە لەسەر بەردێک دەسووڕێ . نێوی کۆڵدراوە . ناوی بەردەکە " **بەردەسماتە** "یە رەش وقورسە لەدارێک گیراوە وئەودارەلە سەرەوە بەهۆرەبلێندو نەوی دەکرێ .

**تێبینی (۵)** : دەبێ بلێین بەرداشی سەرەوەشی پێهەڵدەستێ ونەوی دەبێ کەبەم کارە دەڵێن " **پێ لێ داخستن و پێ لێ هەڵێنان**) . بۆدرشت و وردی **دان**" بەکاردێ یانی درشتی بهارێ یاورد .

**بستە :** وەک باسی کرالە سەربەردێک دەسووڕێ . لەنێو گەرووی بەرداشی خواروو دایە بۆ قایم کردنی بستەلە**هۆرە وسیرمە** کەڵک وەردەگرن هەتا دانەکە لەسەرەوە نەرژێتەنێو ئاو یانی **دانەرێزەی** نەکاو بەکوردی **نەمیزێ**.

( بەردی ئاش)بەرداش دوون

ا ـ **بەردی ژێروو**

ب ـ **بەردیسەروو**

بەردی ژێرەوودا بەسترا وەو بستەی لەنێوەراستها تۆتەدەر بەرداشی سەرەوە کەدانە بەستراوەو دەسوورێ .

بەسەری بستەکەوەئاسنێک هەیە بەرداشی سەرەوەی سوار دەبێ کە پێی دەڵێن" **تەوەرە** "

**تێبینی(٦)** بەرداشی سەرەوە بەهۆی تەوەرەوبستەدەسوورێ .

**بانێژە** :ئەو جێگایەیا ئەوشتەیە کەگەنمی تێدەکەن ولەتەختەسازدەکرێ . وەکرحەتی نەوت دەچێ بەلام قولینچکی دراوەتێ ،یەک دوو گەزلە بەرداشی سەرەوە بلێندتر دامەزراوە .

**کەویژە** : ئەودارەیا ئەو تەنەکەیە گەنمی پێدادەچێتە گەرووی بەرداش ئەویش هەر وەک دۆڵاشوجۆگەدەچێ .

**چەقەنە** :دارێکە بەسەری بەرداشی سەروودا رایەڵ

کراوە . مەودای لەگەڵی بستێکە بزمارێکی لێدراوە وئەو بزمارەشۆڕبۆتەوە بۆسەر

بەرداشی سەرەوە وبەحاڵ وێی دەکەوێ .دەبێ بگوترێ کەویژە لەسەر چەقەنەیە ،بە لەرزینەوەی چەقەنەکەویژەکەش دەلەرزێتەوەودانەکەی ‌رانا گرێ و وردەوردە بۆنێوان هەر دووک بەرداشی بەرێ دەکا .

**تێبینی(٧)** لەدەوری بەرداشی ژێرووبەقەت چوار قامک قوڕ هەڵدەچنن وتەنیا بستێک لە سەرقوولکە ئاردەکەی دەهێڵنەوە ،وئاردەکە بەوێدا دێتەخوار **قوولکەی ئاش** بەوحەوزە ، دەڵێن لەپێش دەمی بەرداشەکان سازدەکرێ ووەک باس کرا ئاردەکەی دەچێ !

**تێبینی(٨)** بۆماشتنەوەی ئاردلە قوولکەی ئاش دووشت پێویستن .

الف-بێل

ب ـ **کەولەبەرخ**

**ئاشەوان** :ئەوکەسەیە کە بەسەرئاشی رادەگا . ئاشی ئاوێ کەمتر بەملکایەتی ئی ئاشەوانە . خاوەن ئاش ئاغاوەت یا پیاوی دەست ، رۆیشتووبوون !

**ئاشێر** : ئەوکەسەیەباراش دێنێتە ئاش بۆلێکردن.

**ئاوناش** ( ئاوان) بریتی ـ یەلە هەقی لێکردنی باراش جا لەگەڵ ئاڵ وگۆڕی زەمانە فەرقی کردووە . وەک پازدێک دوازدێک ،دەیەک و ... یانی بۆوێنەلە ١٥ کیلە یەکیان هەقی ئاشە .

**تێبینی(٩)**: **کیلە** ، پەیمانەیەکە لەزۆر جێگا

پووتێک گەنم دەبا ،ئی واش
هەیە کەمتر یاپتری دەبا
لەدارسازکراوە. **دارکیلەشی**
هەیە بۆ **دارمالٚ** کردن کە
خڕوراستە و دووسێ بست درێژە
**تێبینی(١٠) :ربەش** لەئاش
بۆ پێوان بەکاردێ **شەش**
**مست** دەبا کەدەکاتە (**سیەک**)
یا **دووکیلۆ. کەپوولەش** هەیە
کەهەرنیوسیەدەبا .

**زمهەر** :بریتی یە لەو
گەنمەکەلەپایزەوەلێ دەکرێ
هەتابەهار یاتائاش هەلٚدەبە-
سترێتەوە .

**تێبینی(١١)** بەردی ئاش
زۆرترلە **داشکستان** سازدەکرێ
بۆهێنانەوەی ئەوبەردە
قورسانە لەنێرگە کەلک
وەردەگیرێ .

**تێبینی(١٢) :نێرگە**:دارێکی
درێژ بەناوی تیرە لە
گەرووی بەرداش رادەکەن بە
شەش حەوت کەسان ئەمبەرئەو
بەری دارەکە دەگرن هەتا
بەردەکە نەکەوێ . دووگوریس
لەم لاوئەولای دارەکەدەبەستن
وەدە**نیری** کەلٚ یاگای دەخەن
ئەوجار بەیەک دوویەکان
**لەنگەری** بەردەکە رادەگرن
وکەلٚ وگا دەنگ دەدەن. بەرد
**لاجەولاج** بەدوایاندا دەخشێ
بۆئەوکارەچەند جووت کەلٚ و
گا دەبەن تا نۆبەیان پێ بکەن
ئەوپیاوانەی لەنگەری بەردەکە
رادەگرن ئەوانیش نۆبە
دەکەن تازۆر ماندوو نەبن

**تێبینی(١٣)** بۆلابردنی
بەرداشی سەرەوە لە **لەوازە**
کەلک وەردەگرن.لەوازەدارێکی
دووگەزی یە کەلەگەرووی
بەرداشی دەکەن وپێی لادەبەن
پاش لەوازە **گردەلٚەی** وەبن
دەدەن وەدەیهێننەخوار **گردەلٚە**
دارێکی لەگەز کەمترەوئەستوو-
رایی لە ئالٚوودارێک زیاترە
ولە کۆلٚەکەیەک کەمترە

**تێبینی(١۴)** پاش ماوەیەک
کارکردن بەردەکان دەسوێن
دەبێ **بیراز**بکرێن . هەرووەک
گوتمان بەلەوازە وگردەلٚە
بەرداشی سەرەوەلا دەبەن وبە
چەکوچی تایبەتی خۆی بیرازی
دەکەن . بەردی بنەوەهەرلە
جێی خۆی بیراز دەکرێ .

**بیراز** : بەردەکان گڕنی
گڕنی دەکەن وەک دەستاڕ .

**کۆرەگە** : ئەوجێگایەکە
ئاوی ئاشی لێ دەچتەدەر .

**شێلگە** : ئەگەر ئاش کاری
نەکرد ئاو بەشێلگەدا دەچتە

خوا رسپاسی **وەستا عەلی کوڕی ،**
**حاجی وەستا محەممەدی قۆیتەلٚ**
دەکەم کەلەم بارەوەیارمەتی
دام .

# مامۆستا عەلی مەردان

سەید عەبدوڵلا سەمەدی

"کوردەواری لە هەزاران ساڵەوە خێوی مۆسیقا بووە ، لەبەر نەخوێندەواری زۆربەی هونەر لەدەست چوو. "هۆرە"ی هەبوو بۆ رازونیاز لەگەڵ هۆرا واتا میترا . "کەلۆریشی" هەبوو بۆ ستایشی بوغی گەورە واتا ئەهورا . بە ئاوازی "خورشیدی" پێشوازی لە تیشکی هەتاوی ئاسۆ دەکرد. بە "**خاوکەر**" خواحافیزی دەکرد لە خۆر لە زەردەی دەمەکەل "**ستران**"ی هەبوو کە لە سەردەمی حەزرەتی ئیبراهیم وئازەردا ئەستێرە پەرستان زەمزەمەیان پێدەکرد لەدەشت و دەردا. "**قەتار**" کە رەنگە هەر گاتا بێ وگۆڕابێ تایبەتی گاتا خوێندن بوو . **ئەڵلاوەیسی شی** دانابوو بۆ زەمزەمەی یەسنای مەزن لەسەردەمی ماد ئە هونەری مۆسیقا کەوتە برەو سەدای "**مادهۆرە**" لە کۆشکی شا هەڵدەستا بەرۆژ و بەشەو. "**لاوک**"ی پڕسۆز لاوانی هان دەدا بەرەوپێش کە بە

نەوای "**عوشاق**" و"**ئۆرفە**" دڵی جەفاکێش بڕەخسێنن . "**هۆبەیت**" کە بەزۆر مەقام سوو دەکوترا وەرگەڕا بە"**بەیات**". "**سوارۆ**"ش ئاهەنگێک بوو دوژمنی لەبەر هەڵدەهات. "**ئای ئای**" کە شینی گیانبازانی نیشتمانی پێ دەگەڕا جەرگی لێقەوماوانی پێ هەنجن هەنجن دەکرا. "**سەحەری**" و"**تێ هەڵکێش** و "**نیوەشەو**" لە ناو مەقامەکاندا پلەیان بەرز بوو. سۆزی دەرویش و"**سیاچەمانە**"ی هەورامی دڵی پەرۆشیان لەخەم رزگار دەکرد. "**قەزاز**" و "**ئۆرفە**" و"**دەشت**" و "**سەبا**" لەنێو کوردەواریدا فەوتاوەهەر شوێنەواریشیان نەما. "**ڕاست**" و **سێ گاو پەنجگاو حەیران** کوڕوکاڵ دێنێتە سەیران ئەمانە بوون مەقامەکانی بەناوبانگی کوردی کەمامۆستا عەلی مەردان پتر لەچل وپێنج ساڵی تەمەنی خۆی بۆبووژاندنەوەیان تەرخان کرد.

بولبولێکی دەشتی شار باژێر لەبنەماڵەیەکی ئایینیدا لاوێکی دەستەباڵا وگەنم رەنگ کە تەمەنی دەگاتە دە ساڵ لە مزگەوتێکی ئەمکوردستانە قوڕئان ختم دەکا و لەم مزگەوتەوە بۆ ئەو مزگەوت بەهۆی بنەماڵە و پلەی، ئایینییەوە بەدوای تەجوید وخوێندنەوەی قوڕئانەوە وێڵ دەبێ .

لەبەرەبەیانی رۆژی هەینی رێکەوتی **٢٤**ی مانگی جولای ساڵی ١٩٨١ دا مامۆستای مەقامی کوردی،خاوەنی ئەڵلاوەیسی و قەتار و خاوکەر، مامۆستا عەلی مەردان لەتەمەنی حەفتا وحەوت ساڵیدا دنیای بێ بەقای بەجێ هێشت وبۆیەک جارەکی پێلووی چاوی لێک ناوهەنیسکی پڕ لە سۆزوعاتیفەی راستەقینەی خاوەندی مەقام **و** بەستەی دەشتی گەرمیان و شارباژێر لەسیەکانی برا.

ئەگەر بێتوو باسی ژیانی مامۆستاعەلی مەردان بکەین ئەوە بە کتێبێک و دوان کۆتایی نایە.بەڵام بۆئەوەی هەندێک لایەنی شاراوەی ژیانی ئەو هونەرمەندە بخەینە بەرچاو پێویستە لەم وتارەدا چەند تیشکێک بخەینە سەرئەم لایەنانە .

"**باوکم ناوی عەبدولقادر و**

**باپیرەم ناوی عوسمان و خۆشم "ناوم عەلی مەردا ن"ە.** لەعەشیرەتی بەرزەنجە و بنەماڵەی سەیدەکانی ناوچەیە بووە . لە ساڵی ۱۹۰۴ دا لەگوندی **"کانی سارد"**ی شاربازێر چاوی بەئاووهەوای پاکی ئەم پارچە زەوی یە خۆشەویستەی کوردستا ن هەڵێناوە لەساڵی ۱۹۱۴ دا کاتی بەرپا بوونی شەڕی یەکەمی جیهانی ئەوساڵە چۆتە مزگەوتی **مەلا ساڵح غەریب** لەگوندی خۆیان ولەخزمەت ئەو فێری قورئان خوێندن بووە و یەکێک لە قۆتابی یە ژیرەکانی حوجرەی ئەو مزگەوتە بووە .بەرەحمەت بێ مەلا ساڵح غەریب هانی مامۆستا عەلی مەردانی داوەو دەنگی ئەوی لە خوێندنی قورئان دا زۆر پێ خۆش بووەو هەمیشە خۆشی ویستووە.

لەساڵی ۱۹۱۹دا هاتۆتە کەرکووک ولەوێ لەمزگەوتی **"مەلا محەممەدی ئوممە"** لە خزمەت ئەو زاتەدا فێری تەجوید وقورئان بووە. لە سەرەتای ساڵانی ۱۹۳۷یا ۱۹۳۸، هاتۆتە شاری بەغدا وچاوی بە کابرایەک کەوتووە کە لە کونجێکی شۆریجەی بەغدا دووکانێکی بچووکی هەبووە . ئەوکابرایە ناوی **"محەممەد سەعید"** بووە کەئەو کاتە چەندجۆرە مەقامێکی زانیوە. لەوانە ،**"ئەڵڵاوەیسی"** و **"خورشیدی"** و **"قەتار"**کەمامۆستا عەلی مەردان شتێکی زۆری لێ فێر بووە و سوودی لێ وەرگرتووە .

بۆ یەکەم جار لە ساڵی ۱۹۳۹دا سەری لە ئیزگەی کوردی بەغدا داوە ،هەروەکوو خۆی دەگێڕێتەوە یەکێک بووە لەو دەنگ خۆشانەی بڕەوی بەئیزگەی ساویلکەی ئەو سەردەمە داوە. لەوێ چاوی بە **" کامیل ئەمین "** و **"عەبدولقادر قەزاز"** و **" کەریم زانستی"** و **"کەریم دەوڵەت "** کەوتووە کە ئەودەمبەرێوە بەر وکارمەندی ئەورادوێیە بوون .

مامۆستاعەلی مەردان لە شیعری زۆر شاعیرانی کورد وەکوو : **" شێخ سەلام "** و **" کەریم زانستی"** و **" ئەحمەد هەردی"** گۆرانی ومەقامی بە گوێی خەڵکی کوردستاندا چرپاندووە هەر وەکوو لەگۆرانی **" ست فاتمە"**ی شیعری **"ئەحمەد هەردی"**دا دەردەکەوێ .

مامۆستا عەلی مەردان مرۆیەکی ساویلکەوبێ دەعیە **و**تابڵێی دەمبەخەندە و قسەخۆش بووە.

لەساڵی ۱۹۳۹دا مامۆستا عەلی مەردان ئەندامێکی کۆڕی مۆسیقای عێراق بووە لە کۆنگرەی مۆسیقای شاری قاهیرەدا.

لێرەدا مادامێکی هاتینە سەر **ئۆغر** وگەڕانی مامۆستای خوالێخۆشبوو، پێویستە ئەو خالە روون بکەینەوە کە بەندە بەسەرەتای ژیانی هونەری یەوە ،ئەویش ئەوەیە کە لەساڵی ۱۹۴۷ و ۱۹۴۸ ، چووە بۆشام وبەیڕووت لەوێ ئاهەنگێکی پێشکەش کردووە، بەڵێ، مامۆستا عەلی مەردان هونەری تازەی ئەو کاتەی کوردی گەیاندۆتە دەرەوەی سنوور، لەبەیڕووت وشامدا تێگرایی شەش ئاهەنگی کۆرانی گوتووە لەمەقامی **"ئەڵڵاوەیسی"** و **"قەتار"** و**"خاوکەر"**دا وگۆرانی کوردی بەخەڵکی ئەو وڵاتانە ناساندووە .

**مامۆستاعەلی مەردان** لە سەرەتادا لە کۆمپانیای **"چەخماقچی "** لەسەر سەفحە گۆرانی تۆمار کردووە. لە ئیزگەی بەغدا هەمووئێوارەیەکی دوو شەممو وهەینی ئاهەنگی بڵاو کردۆتەوە ودڵی گوێگرانی بەدەنگە پاراوەکەی، لاواندووەتەوە.

لەوانەیە شتێکی سەیر بێ گەر بڵێین ماموستا عەلی مەردان دەورگێڕی چیرۆکی تەمسیلی بووە. هەر وەکوو خۆی دەڵێ : **دەگەڵ مامۆستا "رەفیق چالاک"ی خوالێخۆشبوو - دا لەسەرەتای ساڵانی پەنجا تەمسیلی بۆ ئیزگەی کوردی بەغدا کردووە.**

مامۆستا عەلی مەردان مەقامی بەزمانی فارسی و عەرەبی وتورکیش گوتووە .

مەقامی "**راست**" کەجۆرێکــی
مەقاماتی رۆژهەڵاتە،ئەم بــە
زمانی عەرەبیش گوتوویەتی .
ماموستاعەلی مەردان هەموو
جۆرە مەقامێکی گوتووەوهەمووشی
بەباشی هێناوە، و ئــەم
مەقامانەی تۆمار کردووە :
"**ئەڵڵاوەیسی**"،"**قــەتــار**"
"**خاوکەر**"،"**خورشیدی**"،"**بەیات**"
"**بەهەموو جۆرەکانی یــەوە**"
"**سەبا**"،"**راست**"،"**هومایوون**"
"**نەهاوەند**"،"**حیجاز**"،"**بەهەموو**
**جۆرەکانی یەوە**"،"**ئۆرفــە**"
""**عوششاق**"،"**عەجەم**"،"**چارگــا**"
"**پێنج گا**"،"**سێ گا**"،"**نــەوا**"
"**دەشت**"،"**غەمەنگیز**".
لێرەدا دەبێ بوەستیــن و
تۆزێک تیشک بخەینــە سـەر
مەقامێکی ئەو مامۆستایـە
ئەویش مەقامی "هیجرانی"یـە
کە شیعرەکەی هی شاعیری کورد
"**ئەخۆل**"ە.

شەرتە تارۆژی حەشرخولیایی
من بێ چاوی یار
وێڵی سەحرابم هەمیشەتەرک
بکەم خوێش ودیار
شەرتەوەک فەرهادقوڵنگـی
یادی شیرن هەڵگرم
تالەپای کێوی فیراقا جێ
بهێڵم یادگار...

ئەم مەقامە وەکوو گوڵێکی
تازە لەنێو مەقامەکانـی
کوردی دا بۆنی پژاند ، تـا
ئێستا ولە رابردووشـــدا
کەسێک هەڵنەکەوتووە ئــەم
مەقامە بڵێ،کەوایە مامۆستا
عەلی مەردان داهێنـەر و
بناغەدارێژی ئەم مەقامەیە ،
کە هەر لەوێشەوە گۆرانـی
"**بەیادمکە**"ی لێ دەبێتەوە .
عەلی مەردان لەگۆرانی یە
- کانیدا باسی خۆرسکی
رەنگینی کوردستان دەکا ،
باسی شاخ وداخ وکانیاوی سارد
وروون وزوڵاڵی ئەو وڵاتە
دەکا . بۆ ئاووهەواودەشت
ودەرو جل وبەرگ وکارەکارِی
مەڕو قیرەوهەراوشمشاڵێ
شوان و جووتکردنی گا وبۆ
کاکی جووتیار وکرێکار وژن و
منداڵ وپیرو پەک کەوتەوپیری
وتافی لاوێتی وژیان وخێزان و
دڵداری ومامەو... هەموو
لایەنێک گۆرانی دەڵێ.
بەڵێ، ٧١٣ گۆرانی ومەقام!
کەهێندێکی تۆزی کات وزەمانەی
لێ نیشتووە وهێندێکی دیکە
بەداخەوە ون بوون ! ئەو
ئەرکی خۆی بەجێ هێناوە وبە
ئێمەی سپاردووە وەک خۆی
دەڵێ :
"**من لێرە ئەتوانم بڵێم**
**قەت بەقەد سەرەدەرزی یەک**
**مەقام نەماوە کەمن تەسجیلم**
**نەکردبێ ، کەمن نەموتبێ ....**
**ئینجا ئایا ناتوانم بڵێم**
**لێی ئەدەن ، لێی نادەن، چی**
**لێ ئەکەن ، چیان لێکرد ،**
**ماوە؟ برایەوە ؟ نازانم**
**ئەوە نازانم .فەقەت ئەوەی بە**
**من سپێررا لەو وەختەیە ئەو**
**شریتە بەدەست من درا.**
**- ئەوە تەسجیل کە !**
**- بان چاو.**
**- ئەوانە مەزمەحیل**
**تەسجیل کراون ...**"
کاتێک کە باسی ئەم
هونەرمەندە خۆشەویستە
دەکەین دەنگە خۆشەکەی وەکـی
زەنگوڵە لەبن گوێمان
دەزرینگێتەوە و"**گوڵەباغ**" و
"**مامە**"و"**تافی لاوێتی**"و"**لێم**
**یاغی یە**"و"**پەچەکەت لادە**" و
"**کاکەی شوان**" و
"**ئای چەندمخۆش دەوێ**" و
"**بەیادمکە**" و"**کراس**
**کوودەری**"و"**دانەدانە**"و
"**ئەروی ئوغر**"و"**شەکرە سێو**"و
"**ئەی مانگ**"و"**گیانەبەسیەتی**"و
"**هەوری لەمل**"و"**خاڵەی ریبوار**"
و....مان وەبیر
دێنێتەوە .
لەکۆتاییدا دەڵێین هەزار
سڵاو لەگیانی پاکی مامۆستا
عەلی مەردان ،ئەو لەدڵـی
هەموو کوردێک دا،دەژی . لـە
دڵی هەموو هونەرمەندێک
هەموو هونەردۆستێک ، هەموو
گۆرانی بێژێک وروشنبیرێک .
هەرچەند هونەری کوردی
بەکۆچ کردنی مامۆستا عەلـی
مەردان زیانێکی مەزنـی
پێگەیشت بەڵام ئەو هونەر-
مەندانەی ئێستا هەن دەبێ
ئامۆژگاری یەکی ئەوفەرامۆش
نەکەن کە بەردەوام داوای لێ
دەکردن،هەوڵ بدەن ، شەرم
مەکەن خزمەتی هونەری کوردی
بکەن

برسێتی بەدزی پارێزی بۆهێنام .لەپێشدا نەمدەزانی چیە . کە یاریم دەکرد برسێتیشم هەمیشەلەگەڵ بوو . بەڵام ئەمجار فەرقی هەبوو.

شەو بوو .کە لەخەوراپەڕیم تەماشام کرد برسێتی ، کز و مردەلۆخە ، بە سەرمەوە راوەستاوە وزەق زەق تێم دەڕوانێ .پێشتر ئەوەندەم لە گەڵ دوژمن نەبوو. ئەوەندەش بەسام وناموٚ نەبوو. وەک جاران بوو، بەڵام ناچاری دەکردم هەر بکڕووزێمەوە و بپاڕێمەوە تا پەنجەیەکم نان پێ بدەن .کەیەک دوو پارووشم نانی وشکی دەخوارد، تێر دەبووم .بەڵام ئەمجاربرسێتی بەربینگی گرتبووم. ترساندبوومی ،تووڕەورقەسووی کردبووم .ئیتر لەو وەختەوە هەرکاتێک لەبرسان دەستم بە نووزە نووز دەکرد، دایکم لیوانێکی چا بۆتێدەکردم و چەند دەقیقەیەک زگم لەقووره قووڕ دەکەوت . ئەمما پاشان برسێتی چەنگی لە خالیگەم[2] دەپێکا . ریخۆڵەم لەبرسان پێچی دەدا و ژانی دەکرد . لەوەختی وادا سەرم لەگێژەوە دەهات وسۆمای چاوم کەم دەبۆوە وبەبێ حالی کایەم دەکرد. وردەوردە ناچار بووم لە شوێنێک رۆسەکنم[3] بزانم خەریکە چم بەسەربێ .

ئێوارەیەک ناڵاندم: " دایە ئەمن برسیمە."

دایکم کە دەیویست وەپێکەنینم بخا تا برسێتیم لەبیر بچێتەوە ، گوتی :

" خۆت هەڵاوێ " مرسی[4] " بگرەوە !"

" مرسی ،مرسی ئیدی چیە ؟"

گوتی :

"منداڵ ئەگەر برسی یان بوو، مرسی دەخۆن ."

" خۆشە ؟"

"نازانم."

" ئەدی بۆچی دەڵێی خۆت هەڵاوێ بیگرەوە ."

دایکم بزەیەکی بەلێودا هات گوتی :

" چونکە کوتت برسیمە ."

زانیم سەرم داویتە سەر تووڕە بووم. گوتم:

" ئەمن برسیمە یاڵڵا ."

" دەبێ راوەستی ."

" نەخێر ئەمن ئەلعان ، ئەمن ئەلعان نانم دەوێ ."

گوتی :

" ئاخر ئەلعان هیچمان نیە بیخۆی ."

" بۆ نیمانە ؟"

گوتی :

"چونکە نیمانە ئیدی ."

کولی گریان ئەوکی گرتبووم .

گوتم :

" ئەمن نانم دەوێ ."

دایکم دیسان گوتی :

" هەرئەوەیە کوتم . دەبێ سەبر بگری "

" ئاخر ئەمن برسیمە
برسی ."
دایکم خەریکی ئوتووکێشانی
جل وبەرگ بوو . سەری هەڵبڕی
وتەماشای کردم .چاوی پڕبوو ن
لە ئاو. گوتی :
" دەزانی بابت لەکوێ یە ؟"
" گێژ بووم. بەسەیرەوە
چاوم لە دایکم بڕیبوو .
وەبیرم هاتەوە بەینێکە باوکم
نایەتەوە ماڵێ ، چونکە ئیتر
بەرۆژ دەمتوانی بەکەیفی خۆم
هەڵبەزدابەز بکەم. نازانم
بۆ لەنەکاو ون بوو. ئەڵبەتە
لەدڵی خۆمدا پێمخۆش بوو ،
چونکە ئەگەر لەماڵ بوایە
لەترسی گوڕە گوڕی نەمدەوێرا
ببزووم. بەڵام نەمزانیبوو
ئەگەر باوکم نەبێ ،نانیشمان
نابێ .
گوتم : " نازانم."
دایکم گوتی :
" دەزانی کێ نانی بۆ
دێنایەوە ؟"
گوتم :
" بابم ،هەمیشە بابم
بۆی دێنایین ."
" باشە ئیدی ئەلعان
بابتان لێرە نیە ."
" چۆتە کوێ ؟"
" نازانم ."نەماوە"
پێم بەزەویدا دا و ملم لە
نووزە نووز نا:
" ئەمن برسیمە ، ئەمن
برسیمە ."
گوتی :
" راوەستە باکارێکی
پەیدا بکەم .ئەودەم نانیشمان
دەبێ ."

رۆژ زۆر بە شێنەیی
رادەبردن .ئیتر دەردی ،
برسێتی ویادی باوکم ئامێتە
ببوون .کە برسی دەبووم و
دڵم لە خێڵەکەوە دەهات[5] ،
باوکم وەبیر دەهاتەوە .
ئاقیبەت دایکم لەجێگایەک
کاری دۆزی یەوە . بوو بە
ئاشپەز. من وبراکەشم رۆژانە
بەتەنێ لەماڵ دەبووین .
خواردنیشمان لەتە نانێک و
قۆری یەک چا بوو. دایکم
کە ئێواران لەکار دەهاتەوە
هێزی نەبوو .غەمبار بوو.
هەمیشە لە شوێنێک هەڵدەکورما
ودەگریا .جاری واش بوو دڵی
زۆر تەنگ دەبوو ، بانگی
دەکردین وچەند سەعاتان هەر
قسەی بۆدەکردین . دەیگوت:
" ئەنگۆ تازە بابوو نیە
لەگەڵ منداڵی دیکە فەرقوو
هەیە .دەبێ فێربن ئاگاتان
لەخۆتان بێ ،بۆخۆتان لیباس
دەبەر بکەن وچێشت لێ بنێن."
دەیگوت:
" وەختێکی ئەمن دەچمە
کارێ، ئەنگۆ دەبێ زۆرچاک
ئاگاتان لەماڵێ بێ ."ئێمەی
حەبەساویش بەدڵ بەڵێنمان
پێدەدا .بەڵام هەرچی سەرمان
هێنا وبرد بۆمان مەعلووم
نەبوو بابە چی لێ هاتووە و
دایە بۆوەک جاران نەماوە !
قسەی دایکیشم تەنیا
دەیترساندین .کاتێک لێمان
دەپرسی بۆچی بابە رۆیشتووە ،
دەیگوت :
" ئەنگۆ جارێ منداڵن،ئەو
شتانە نازانن ."

ئێوارەیەک دایکم گوتی :
" ئیدی لەوەبەولاوە ئەتۆ
دەبێ بچی شتی ماڵێ بکڕی ."
پاشان دەستی گرتم وبردمی بۆ
دووکانێکی نزیک ماڵی خۆمان.
دەیویست فێرم بکا چۆن شت
بکڕم .بەخۆم دەفشیم[6]. پێم
وابوو ئیتر گەورە بووم .سۆزی
پاش نیوەڕۆ ، قۆڵم لەدەسکی
زەمبیلەکە کردوبە پیادەڕۆدا
بەرەو دووکانەکە هەڵکشام .
کە نزیک بوومەوە ، چەند کوڕ
بەسەرمدا چرژان وبەمستان
بە هەردیاندا دام. پاشان
زەمبیلەکەیان لێ ئەستاندم
و پارەکەیان لەدەستمدەرهێنا
وبەگریان بەرێیان کردمەوە .
کە ئێوارە داهات ، دایکم
هاتەوە . نەقڵەکەم هەموو بۆ
گێڕایەوە .هیچی نەگوت .
تەنێ دانیشت وسەرلەنوێ
هێندێک شتی لەکوتەکاغەزێک
نووسی .پاشان پوولی پێدام و
ناردمیەوە بۆ شتکڕین . بە
لۆژە لۆژ[7] لە پلیکانان هاتمە
خوار. کوڕەکان هێشتا لە
خەیابان خەریکی کایەبوون
بە هەڵەداوان گەڕامەوە
ماڵ .
دایکم گوتی :
" چیە دیسان ؟"
" هەتیوەکان راوەستاون
دەیانەوێ لێمدەن ."

گوتی :
" دەچی ،هەرچونێک بێ، شتەکان دەکڕی ودێیەوە .دەبڕۆ دەی ."
گوتم:
" ئەمن دەترسێم."
گوتی :
" دەڵێم بڕۆ. ئەوانیش بە هێند مەگرە ."
چوومە دەرەوە وخێرایەک بە پیادەڕۆدا بۆ لای دووکانەکە چووم. خوداخودام بوو کوڕەکان دیسان پێشم پێ نەگرن .بەڵام هەرکە گەیشتمە ئاستیان،یەکیان هاواری کرد :
" ئەوەتا ،دیسان هاتەوە!"
هەموو هێرشیان بۆ هێنام.
منیش وەک شێتان دەرپەڕیم و هەڵاتمەوە بۆلای ماڵ . بەڵام گەیشتنە سەرم ولە پیادەڕۆ لە عەرزیان دام ونایانمە ژێر. هەرچی پاڕامەوە وهاوار وپەلەقاژەم کرد فایدەی نەبوو. پووڵەکەیان بەزۆری لە چنگم دەرهێنا ،پاشان بە راکێش راکێش راستیان کردمەوە وبەزللەوشەقان ناردیانمەوە بۆماڵ . بە رێگاوە هۆڕ هۆڕ دەگریام . دایکم لەبەر دەرگا راوەستابوو .بەدەم هەنیسکانەوە، گوتم :
" ئەو هەتیوانە... لێیان .... لێیان دام ."
لە پلیکانان سەرکەوتم. بەتەما بووم خۆم لە ژووری باوێمەوە. دایکم گوتی :
" نەیەوە ژوورێ!"
لەجێگای خۆم چەقیم وچاوم تێ بڕی .گوتم :
" ئاخر وەدوام کەوتوون."
دایکم بەجۆرێکی بەسام قسەی دەکرد. گوتی :
" لەجێی خۆت راوەستە. ئەمن دەبێ ئەوشۆ فێرت بکەم کە چۆن دەبێ لەسەر هەقی خۆت وەجواب بێی ."
پاشان چۆوە ژوور .منیش لە جێی خۆم چاوەڕوان مام . زۆر دەترسام .نەمدەزانی دایکم دەیەوێ چ بکا. زوو گەڕاوە بڕێک پارەوکوتەکاغەزێکی بەدەستەوە بوو. داریکی درێژ وئەستووریشی لەدەستەکەی تردا بوو. گوتی :
" ئەوە پووڵ و کاغەز ئەوەش دار، دەچیە دووکانەکە ئەوی لەوکاغەزەم نووسیوە، دەیکڕی ودێیەوە. ئەگەر ئەو هەتیوانەش دیسان پێشیان پێ گرتی بەودارە لێیان دەدەی ."

زۆرم پێ سەیربوو. دایکم دەیگوت دەبێ لەسەرخۆت بکەیەوە. پێشتر قەتشتی وای نەدەگوت.
گوتم :
" ئەمن دەترسێم."
گوتی :
" ئەوشتانە دەکڕی چاکە دەنا ناهێڵم پێ دەو ماڵە بنێیەوە .
گوتم :
" ئاخر ئەو هەتیوانە لێم دەدەن ."
" دەجا هەر لە خەیابانێ بە .تازە مەیەوە ماڵێ ."
" بەپرتاو لە پلیکانان وەسەر کەوتم .هاتم پالێک بە دایکمەوە بنێم و خۆبە ژوورێدا بکەم. بەڵام شەقەزللەیەکی لە بنانگوێم راکێشا . دەتگوت لە نەکاو شتێک پێوەی دام. چوومەوە سەر پیادەڕۆ، راوەستام و بەگریان وپاڕانەوە گوتم:
" دایەگیان تۆخودا سبەینێ دەچم ،سبەینێ ."
گوتی :

"نا ، دەبێ هەرئێستا بچی . بەدەستی بەتاڵیش بگەڕێیەوە ئازای ئەندامت دەشکێنم ."

پاشان دەرگاکەی توند داخست .خرەی کلیل هات . لەترسان ئەژنۆم دەلەرزی. بە تاقی تەنیا لە خەیابانێکی تاریک وبەسام وەستا بووم و چەند کوڕیش بەدوامەوە بوون. دەبوو یا لەماڵێ وێم بکەوێ یا لە خەیابان . دارەکەم توند لەمستم گرتبوو ئەسرینم دەباراند .دەمەویست هەردووک لا هەڵسەنگێنم .ئەگەر لە ماڵەوە لێیان دابام چم لە دەست نەدەهات .بەڵام لە خەیابان دەمتوانی دەست بکەمەوە .بەپیادەڕۆدا بەرەو دووکان وەڕێ کەوتم. تا دەهات لە کوڕەکان نزیک دەبوومەوە. دارەکەم توند لەدەستم گرتبوو. لەترسان هەناسەم سوار ببوو. ئیتر تەواو لێیان نزیک کەوتبوومەوە.

یەکیان هاواری کرد :

" دیسان هاتەوە. حەملە!"

دەست بەجێ گەمارۆیان دام. بەتەما بوون دەستم بگرن. بۆئەوەی بیانترسێنم ،قیژاندم

" دەتانکووژم!"

تا دەهات ئاڵقەی گەمارۆ-یان تەنگتر دەکردەوە. ترس و خۆف بەر چاومی گرتبوو . دارەکەم هەڵدەسووڕاندوتەنیا گوێم لە تەقەی سەروگوێلاکیان دەبوو. دیسان وەشاندم وسەری یەکیانم شکاند. پاشان لە کەللەی یەکی ترم راکێشا . دەمزانی ئەگەر چاوترووکانێک مۆڵەتیان بدەم ، تازە دەردەچێ .گرم بە عەرزمدا[8] دەدان .دەمەویست وایان لێ بدەم کە گێژو کاس بن و ئیتر نەتوانن راست بنەوە . چاوم پڕببوو لەئاو. ددانم چیڕ دەکردەوە وهەرچی بە زارمدا دەهات پێم دەگوتن . لەترسان بەهەموو هێزودەمای خۆم دارەکەم لەسەریان رادەکێشا .

کاغەز وپووڵەکەم کەوتبوو. بێ نیوبڕ لێم رادەکێشان خەریک بوون بڵاوەیان دەکرد، دەستیان بەسەریان گرتبوو هاوار وناڵەیان بۆ ئاسمان دەچوو. هێندێکیان باوەڕیان نەدەکرد. زەق زەق سەیریان دەکردم. دیاربوو تا ئەودەم ئینسانی وا تووڕەیان نەدیبوو. ئێستا راوەستابووم و وەهانکە هانک کەوتبووم. قەڵسەم لێ دەگێڕان وتێزە تێزەم دەدان تا بێنەوەپێش وشەڕەکە هەڵایسێتەوە. کە دیتم نایەنە بەرەوە، کەوتمە سەریان .ئەوانیش کە زۆر ترسا بوون بەدادوهاوار خۆیان لەماڵ هاویشتەوە . پاشان دایک وباوکیان ، هەموو لێم هاتنەدەر ودەستیان کرد بە گەف وهەڕەشە . منیش بۆ هەوەڵ جار بەسەر ئینسانی لەخۆ گەورەتردا قیژاندم و گوتم :

" ئەگەر لەکۆڵم نەبنەوە لەوەش خراپتریان لێدەکەم ."

پاشان پووڵ وکاغەزەکەم هەڵگرتەوە وچوومە دووکانەکە کە گەڕامەوە دارەکەم قیت بەدەستەوە گرتبوو. ئامادە بووم چاوم بەیەکیان بکەوێ وراماڵی بدەم. بەڵام کەس دیار نەبوو .ئەوشەوە بوومە حاکمی خەیابانەکانی مێمفیس.[9]

---

پەراوێز:

١- ناوی ئەسڵی چیرۆکەکە ( Hunger ) بووە ولە فارسییەوە وەرگەڕاوەتەوە سەرکوردی .

٢- **خاڵیگە** :خاڵیی،کەلەکە.

٣- **رۆسەکنین:** داسەکنین داسرەکان ، سرەوتن .

٤- لەئەسڵی چیرۆکەکەدا ( Kunger ) بووە لەتەرجەمەی فارسیدا کراوەتە "مرسنە"لەکوردی یەکەشدا بوو بە " مرسی" .

٥- **دڵم لەخێڵەکەوە دەهات:** دڵم زەعفی دەکرد.

٦- **بەخۆفشین:**بەخۆنازین لەخۆ بایی بوون .

٧- **لۆژە لۆژ:** لارە لار.

٨- **گرم بەعەرزمدا دەدان :** زرم بە ...

٩- **مێمفیس:**( MemPhis ): گەورەترین شاری ئەیالەتی تێنێسی لەئامریکای باکوور.

# ڕێنوێنی ئەدەبی

سنە :**موزەففەر ڕەوشەن**

شیعرەکانت لاوازن . چەند جێگاش وشەکانت لەت کردوون وەک :

**باران دێتەخوار وەک**
**ئەشکی هەژار**
**تەواو شین دەبێ**
**خاکی کوردەوار**

ئەوجار تەعبیر و بۆچوونی کۆنی زۆر تێدایە و بابەتی نوێی تێدا نابیندرێ

سنە : **عەبەقادر مەرزی**

شیعرەکەت نەوەزنی هەیە و نە قافیە .بەڵام هەستێکی جوانی تێدایە. بۆ نموونە ئەم دوو شیعرە کە باشن چاپ دەکەین .

**گوڵی خوێناوی دڵی زامارم**
**بەهاری ژینمکەژاڵ نازارم**
**بەتیری چڵکن دوژمنی ناپا**
**ـ ک**
**گوڵی ئارەزووم نرایە ژێر**
**خاک**

مەهاباد :**جەمال سەعدی**

شیعرەکەت لە باری قافیەوە زۆری کەموکووڕی هەیە. بۆ وێنە :

(تاوناخ) ، (جواب و ناو) (فغانی ودەناڵی) ، ( خاتر ودڵ) ، (بەس وجەننەت) و .... قافیە نین.

لەباری وەزنیشەوە لەنگەوەک:

**کەژوکێووچیام لێک دابوو**
**دۆزینەوەی یارم**
**وەبەرچاوم نەهات لەیلێ**
**بەتیری چاوی بیمارم**

پتر خۆ ماندوو. بکە چاوەڕوانی شیعری جوانتری ئێوەی خۆشەویستین .

سنە : **نەسرین بیرەوەری**

خوشکێ گیان : ئەم شیعرەی بۆت ناردووین شیعری "مادر"ی ئیرەج میرزایە بەڵام نەتتوانیوە باشی تەرجەمە بکەیەوە . هیوادارین بەرهەمی باشترمان بۆ بنێری.

لە هاوکاریت سپاس دەکەین .

سەردەشت :**سەلام مەمێندی ئازەر**

شیعرەکەت لە دوو سێ جێگا لەنگ ولۆری هەیە کە ئاوا دەست پێدەکا:

**سڵاو ئەی سروە سروەی بەیانی**
**خۆشتربێت لەشنەی شەماڵی شوانی**
**تۆ کە ئەوەندە پڕ قەدر و مایەی**
**هەر چاوەڕێتم ئەدی بۆ نایەی**
**نێو شاری سەردەشت مات ووێرانە**
**هەر قەبرستانە کە ئاوەدانە**

چاوەڕوانی شیعری بە وە*جترین .

بۆکان : **سولەیمان ڕەحیمی**

لە شیعرەکەتدا پاشگری (کەت) ڕەدیفە کەوابوو وشەی (خاووجوان) و (چاوویار) و (ناووخاڵ) نابنە قافیە .

مەهاباد: **ج . خەمبار**

شیعرەکانت زۆر لاوازن. لە باری وەزن وقافیەوە نارێکن و کەم و کووڕی یان هەیە. وەک :

**بێ تۆ تاڵە ژیانم**
**ئەی ڕازێنەری خەیاڵم**

وشەی (لەباروخەیاڵ)و (باڵاو لێوەکان)و (بمرین ودەمرین) و (بپێوین ورۆشن بێ)و (وێران وئازاد) نابنە قافیە.

مەریوان :**ئەحمەد حەیدەری**

شیعرەکەی ئەمجارت خراپ نیە بەڵام دیسانیش پتر حەول بدە. ئەوە بەشێک لە شیعرەکەت جاپ دەکەیس .

**ئاخ چ دڵێ بێ خەبەرێ**
**جازیبە بۆ هەر کەسەرێ**
**هەمغەمی گورگە هەممەرێ**
**هەرغەمە کۆشک و مەنزڵم**
**چارەم چیە لەدەس دڵم**

هیوادارین شیعری جوانترمان بۆ بنێری

سەقز : **مەحموود ئەمینی**

شیعرەکەت گەیشت . ئاوا دەست پێدەکا :

**براگەلی کورد زۆر لە دواوەیە**
**خەرمانی خۆشی بە دەم باوەیە**
**کەمترنین ئێمە لەهیچ میللەتێ**
**عیلموزانستمان بەسەر پاوەیە**

ئەم میسرەعەی ئاخری مانای نیە . وشەی ( دواوەو ئێوە ) ( بەدوپیسەوە ) نابنە قافیە . هەوەڵ شیعر لەباری وەزن وقافیەوە راستە .

چاوەروانی شیعری جوانتری تۆی بەرێزین .

خانێ : **هەیبەتوڵڵا شامخی**

بەداخەوە ئەم کتێبانەی نووسیوتە لە لامان نیە دەنا بۆمان دەناردی . بۆ پتر شارەزابوون لە شیعر دەتوانی کتێبی " طلا در مس" "هنر و ادبیات امروز" ،"فنون شعر وکالبد پولادین آن " و..... موتالا بکەی .

شیعرەکەت لەباری وەزنەوە لەنگە وەک ئەو شیعرە :

**زێدەکەم سوێندم بەلەیل و نەهار**
**زێدەکەم بەهەڵبەست و وتار**

نەغەدە : **بەدرەدین ئیسقێلی**

شیعرەکانت زۆر لاوازن. لەباری قافیەوە لەنگ و لۆری یان تێدایەوهێندێک لە شیعرەکان بێ مانان یا ئێمە بۆمان ساخ نەبوونەوە. وەک :

**بەدەنگی بەرزت کەلەی بێ هۆشان**
**مردووی حەوت ساڵە ئەهێنی بە ژیان**

(هۆشان وژیان)و ( هیوا و خوا ) قافیە نین .

چاوەڕوانی بەرهەمی جوانترین .

سەردەشت :**ئەحمەد پاکدڵ**

شیعرەکەت لە باری وەزنەوە لەنگە .لە هەوەڵەوە جوانت دەست پێکردووە .

**ئەی سەردەشتی جوان شاری دلڕفێن**
**بۆچی تێکەڵ کرای تۆ لەگەڵ خوێن**
**بۆ بەزەیی نەهات بە خەڵکی فەقیر**
**بەمناڵ، بە لاو ، گەنج و پیر**

حەول بدەوشیعری جوانتر بڵێ .

شنۆ: **تەنیا**

ئەگەرچی ناونیشانی خۆت نەنووسیوە بەڵام شیعرەکەت جوانە و ئەگەر ناوت نووسیبا چاپمان دەکرد .

**بسکی لەراند شنەی بەیان**
**بەدی کرا خۆری ژیان**
**مانگێ جارێک مانگێک هەڵدێ**
**هەتا مردن تریفەی دێ**

گیلانی رۆژئاوا : **سەلاحەدین عەبدوڵڵا زادە**

ئەم دوو شیعرە جوانن ئەوە لێرەداچاپیان دەکەین .

خەیاڵ وخەم لەمخۆشیما شەریکن
لەرێبازی ژیانمدا خەریکن
کوڵ وسۆزی دڵم بۆ کوردەواری
دەسووتێنێ گەرچی زۆر خاووفەریکن

بۆکان:**جەعفەرڕووحی زاد**

بەداخەوە شیعرەکەت زۆری لەوادە رابواردووە . چاوەروانی بەرهەمی جوانترین .

**شیعری ئەم ئازیزانەشمان** بەدەست گەیشتووە کە بۆ چاپ نابن یا لەباری وەزن وقافیەوە نارێکی یا لەباری نێوەرۆکەوە کەم و کووری یان هەیە. سپاسیان دەکەین .

**سەردەشت** :سولەیمان محەممەد پوور
**پاوە**: و. فەتاحی
**گەڵوان** : عەلی سووریەزادە
**مەهاباد** : خالەق شیوراک
**بۆکان** : حەسەن قوربانی
**دیواندەرە**:ساڵح گێلاسی
پیرانشار:**مستەفا محەممەدزادە**
مەهاباد :**عەلی عەرەبی**
سەقز :**ئەحمەد ئەحمەدیان**
شنو :**محەممەد حوسێن پوور**

# شاعیرانی لاو

هەموو شەوێ بێ ئیختیار
لە ژووری تەنیایی و خەما
مۆمی بیرم دائەگیرسێ
تا تاریکی ئەم ژیانەم
تا هەڵە و کوێرەوەری یەکان
دەردەکان و ئازارەکان
لەدەفتەری رەشی رابردوو بنووسێ
لەو کاتەیە
پەپوولەی خەو
لەدەوری شەمی خەیاڵما بەدی ئەکرێ
لەو کاتەیە باڵی چاوو باڵی پەپوولە
یەک دەگرن
سەری ماندووم
بە خەونی شیرینی بەیان
لێوی سەرینم ماچ ئەکا

* * *

هەر بەیانی یەک بێ ئیختیار
خۆری بیرم دائەگیرسێ
وردە، وردە دەخشێتە ئاسمانی هیوام
هیوای رووناکی رۆژی نوێ
هیوای راست کردنی هەڵەی دوێ
هیوای بەندکردنی خەمەکان
هیوای بە هیوا گەیشتن
تا ئێوارە لە دڵمایە
لەشم رێگەی لووتکەی بەرزی
هەوڵ و تێکوشان ئەپێوێ
ئا ئێوارە خۆری هیوام
لە کەلی شەوی زەبوونا
ئاوا دەبێ !
دیسان وەکوو هەموو شەوێ
بێ ئیختیار
مۆمی بیرم دائەگیرسێ
" ئەستێرە "

## شەوگەر

**عارف ئاغایی**

ژینم بێ شیعر شۆنەیەکە
شوراوبەی ئاو قەت نابیسێ
دڵم وەکوو شەوگەرێکە
بەدوای شەوگورددا دەگەرێ
شەمزینێکە لەباتی شەم
دەگاتە دەنگی شەوپەرێ
جارجار شیعرم تریفەیە
لەپشت هەڵەموت مەلاسە
بەڵام
کوڵی تەبعی شیعری شاعیر
دووربینێکە
پشت هەموو کێوێک دەبینێ
هەموو بەستێنێک دەشکێنێ
خۆشەویستم
تازەبووکی
تارای سوور بەسەردا دراوە
کە ئەو لە قامووسی ژیندا
شیعری ناوە
شیعرم سۆز و کزەی
زامی دڵە
دڵی کپم بەتاسەیە
بۆ نەسرەی
هەستی ناسکی ناسک هەستان

کەیفی برادۆستی

لە لای کابراکەی بەینمان
بیستم گلەییت کردبوو
گوتبوت ئەو لای خۆی شاعیرە
کەچی نەمدیوە تا ئێستا
لە شیعرێکدا باسم بکا
گلەیی یەکەت لەسەر چاوم
بەڵام بڵێ و ناسکیت
جوانی وشیرینی دەردەبڕێ
بە چ شیعرێ هەموویان
لە کێک ومینوو خاویش
بەتامتری و گەزۆی دەگرێ
لە هەنگوین لەکوێ بەرگە
شیرین تری شیعر دەکرێ
کچێ ئاخر بە من ڵاڵە
باست لەکوێ قەڵەمەکەم
خۆ من خەیاڵە
پەنجەم شکاوی بەمن دەکرێ
وەسفی تۆ چۆن
خوا نەتگرێ

بەبۆنەی بۆمبارانی سەردەشت
لەلایەن رژێمی فاشیستی بەعسی

حوسێن گوژری

سەردەشت ئەی شارە جوانەکەم
بەهەشتی نیشتمانەکەم
ئەی سەرتۆپی کوردستانم
هێزی دڵ ئارامی گیانم
ئەی خۆشەویستم ، وڵاتم
ئەی لان و بنکە وقەڵاتم
ئەی هەرێمی مەردایەتی
گیانفیدایی وئازایەتی
مەڵبەندی مەردانی یەزدان
چاوگەی پیاوەتی و ویژدان
لانی ماد ، ژینگەی گۆرانی
قەڵای بارزان و سۆرانی
هەرچەندە لێشت براوم
بە ناوی تۆ گۆچ کراوم
سەردەشت دوژمنی تۆ پەستە
لەنێوبردنی تۆی مەبەستە
دوژمنەکانی نابەکار
نەیاری تۆ و پەروەردگار
ناترسن لە یەزدانی تۆ
ئەوا بەربوونە گیانی تۆ
بە هەر چەکێکی تازەو کۆن
لێت دەدەن دوژمنانی خۆن
بەتۆپ وناپاڵم و خەردەل
بە جۆرگەلێ زۆری گازگەل
سەردەشت ئەی سەردەشتی بەڕێز
شاری خۆڕاگر و بەهێز
تۆ بۆ خۆڕاگری تاکی
چوویە ڕیزی ناکازاکی
مەکۆی ژان وکوڵ و خەمی
تۆ هێرۆشیمای دووهەمی
تۆ سوور وەسەیدای شێرانی
دێر یاسینی کوردستانی
وا دیسان جارێکی دیکەش
پێیان پۆشیوە بەرگی ڕەش
دیسان وەک چاردەی سەرماوەز
خوێنە دەڕژێ بە لەزوبەز
دیسانیش کرای بۆمباران
ڕۆڵەکانت لە لا تاران
بەڵام نە وەک پاروپێرار
زۆر بە ڕقەوە ئەوی ئەمجار
ئەوجار بە بۆمی شیمیایی
لە شاری بڕی تارمایی
چاون بە مۆلەق وەستاون
سوور و زەق وپڕلە ئاون
هێندێک سووتا و هێندێک برژاو
گەلێکی بێ تاوان کوژراو
هێندێکیش هەر بەحاڵ زیندوون
ئاوارەی سەربستو وزیندوون
دابێژرا لەسەری شار خۆڵ
کرایە شار بەندەن و دۆڵ
لاشکەوتن وەک گەڵای پایز
گلکۆ هەڵقەناون بە ریز
هەر لاپاڵ و باسک و شێوی
هەر کەندو لەندو پەسێوی
هەر بن دار وبەرد و دەری
هەر مەڵبەند و ڕاگموزەری
لەجیاتی شار بووە بە ماڵ
تێی خزاون ژن و منداڵ
بەڵام قەیدی ناکا وابێ
زەمانە هەر وەها نابێ
با ئازاد سەر بنێتەوە
ڕۆژێک دێ ڕۆژت دێتەوە
بەری تەنگانە زۆر کەمە
دوایی دێ ئەو دەردو خەمە
دەبیەوە سەردەشتی جاران
مەکۆی خۆشی وبووکی شاران
دوژمنی پیسی پیرەڵۆک
لە حاندتدا دادەدا چۆک
چاڵ دەکەی ئازارو کەسەر
پشوویەکت دێتەوە بەر
گورژی» ڕۆڵەی تۆیە سەردەشت
دەتبینێ خۆشی وەک بەهەشت

# جوغرافیای شنۆ ٧

بەشی ٤

مارف ئاغایی

ژن هێنان لەناوچەی شنۆ بریتی یە لە: ١- خوازبێنی ٢- ژن بەژنە ٣- هەڵگرتن.

خوازبێنی: جوانترین شێوەی ژن هێنانە. ئەگەر کوڕ وکچ رازی بوون ژیانی هاوبەشیان بۆ چەند کەس لە پیاوانی سەرناس و ناودار لە لایەن بابی کوڕەکەرا دەچن بۆ ماڵە بابی کچەکە ومارەی دەبڕنەوە ئەو شتانەی کە دەبێ زاوا بۆ بووکی بکڕێ بەپێی کاتی دیاری کراو شتەکان دابین دەکا و بە رەسمی تایبەتی ناوچە کچ دەگوێزێتەوە.

شتێک کەسەرنج راکێشە مارەیی کچە. بەداخەوە ئێستاش ئەوەندە پووڵ و مارەیی بەکچەوە دەبەستن کە بۆتە هۆی ئەوە زۆربەی لاوەکان نەتوانن ژن بێنن. دیارە کەس شیربایی ناخوا بەڵام پێیان وایە ئەگەرکچەکەیان لەسەر پووڵێکی کەم مارە بکرێ لێی کەم دەبێتەوە.

وێ دەچێ داب و رەسمی ژن گواستنەوە لە زۆربەی ناوچەکانی کوردستان وەکوو یەک بێ بەڵام بەپێویستم زانی لێرەدا بە کورتی ئاشێرە بە هێندێک لەو دابانە بکەم.

١- لە مانگەکانی سەفەر و موحەڕەم و رەمەزاندا بووک ناگوێزرێتەوە.

٢- ئەگەر یەکێک لە خزموکەسی زاوا یا بووک بمرێ شاییەکە چل رۆژ، وەدوا دەکەوێ.

٣- رۆژەکانی دووشەممۆ وپێنج شەممۆ تایبەتی گوازتنەوەی بووکن.

٤- کاتێک بووک ساز بوو برا و چەند کەس خزمی زاوا دەچنە وەتاغی بووک و برای زاوا یا یەکێک لە خزمانی نیزیکی پووڵ دەبەر پشتێندی بووک دەنێ کەپێی دەڵێن پشتێند بەستن. ئەوجار دەستی بووک دەگرن وحەوت کەڕەت بەدەوری خۆیدا دەسووڕێنن بەو مانایە کە رووسووربێ دوای ئەوکارە برا یا خزمی بووک دەستی دەگرن تا سواری ماشێنی دەکەن ودەگەڕێننەوە.

٥- یەکێک لە ماشێنەکان لەپێش هەموو بەشدارانندا مزگێنی بۆ زاوا دەبا کە

پوولێکی زۆری دەدەنێ.

٦ـ پاش هێنانی مزگێنی زاوا دەچێتە سەربانێکی بڵێند سێوو هەنارو......... بەسەر بووک دا داوێ و خزمان و دۆستانی زاوا لە سەربانی ڕابووک زێڕوەشان دەکەن .

٧ـ خزمانی بووک ڕۆژی پاشتر دەچن بۆ ماڵی زاوا بەناوی سێ ڕۆژانە. بەم چەشنە ئەو داوەتەی کە بەخوازبێنی دەستی پێکرابوو بەسێ ڕۆژانە کۆتایی پێدێ.

**ژن بە ژنە**

ژن بەژنە لە ناوچەی شنۆدا زیاتر لەناوچەکانی تر وەبەرچاو دەکەوێ دیارە کە ئەو کارەش چەند هۆی بنەڕەتی هەیە.

١ـ بەشێکی زۆری خەڵکی گوندەکانی ئەوشارە لەباری ئابووری یەوەفەقیر وهەژارن وتوانای ژن هێنان بەچەشنی خوازبێنی یان نیە. و بە ژن بەژنە دوو خەرجی

قورسیان لەسەر شان وەلا دەچێ یەکەم ژن هێنان بۆ کوڕەکەیان و دووهەم بە مێرددانی کچەکەیان .

٢ـ دواکەوتوویی فەرهە-نگی بۆتە هۆی ئەومەبەستە کە ئێستاش کچ ناتوانێ هاوبەشی ژیانی خۆی هەڵبژێرێ وباوکی کیژەکان هەرکەسیان بۆ خزمایەتی هەڵبژارد ژن بە ژنەی لەگەڵ دەکەن.زۆرجار ئەو ژن بەژنەیە بەبێ رازی بوونی کیژان و کوڕان دەکرێ و تەنیا رەزای باوکی لەسەرەو بەس .

٣ـ لەو ناوچەیەدا کە زۆرجار لەسەر زەوی و زار وئاو.....ناکۆکی دەکەوێتە ناوخەڵک ودەبێتە هۆی نێوان ناخۆشی وتەنانەت شەڕیش. خەڵکەکە هەوڵ دەدەن تا بەپێک هێنانی خزمایەتی خوێنی (ژن بەژنە)پشتیوان و دەستەودەیارە بۆ خۆیان ساز بکەن. بەخۆشی یەوە کەم،کەم ئاکامی ناخۆشی ئەو چەشنە ژن ومێردایەتی ـ یە بۆخەڵک روون بۆتەوە

و ژن بەژنەش بەرەو کەم بوونەوە دەچێ .

**ژن هەڵگرتن :**

ئەگەر خۆشەویستی کچ و کوڕ گەیشتە سەردەمی ژیانی هاوبەشی بەڵام بەهۆی رازی نەبوونی یەکێک لە بنەماڵەکان لەژن هێنان بە چەشنی خوازبێنی ناهومێدا بوون بڕیار دەدەن کە لە جێگا وکاتێکی دیاری کراودا یەکتر ببینن. کچ رەگەڵ کوڕ دەکەوێ.پاش ماوەیەک مەسڵەت دەکرێ و بووک دەگوێزرێتەوە هێندێک کەسیش مەسڵەت وەدرەنگی دەخەن تا رازی دەبن .

**بووک گۆڕینەوە :**

زۆرجار خەڵکی دووئاوایو کە پێکەوە ژن بە ژن دەکەن لەسەر گۆڕینەوەی بووک بەشەڕ دێن. چونکە هەر دووک لا چاوەڕوانن ئەوی دیکەبووکی بەرەوپێش بەرێ. لەوکاتەدا ئەوەی بووک رەپێش بخاخۆ لەویتر بەکەمتر دەزانێ. بۆ وێنە لە ناوچەی دەشتبێڵ سەر بە شاری شنۆ لە شەڕێکی ئەوتۆدا خەڵکێکی زۆرکوژران. ئێستاش بەردێک لە جێگای شەڕی نێوان خەڵکی دوو ئاوایی هەر ماوەو بەردی زاوا وبووکی پێدەڵێن

لە سەرژمێری* ساڵی ١٣٥٥ی هەتاویداکە (دوایین سەرژمێری پێشان دەدا) دەردەکەوێ ١٠/٣ لە سەدی خەڵک کاری تەخەسووسی وفەنی دەکەن . ٤/٣ لەسەدی خەڵک بەرێوە، بەر وکارمەندو دەفتەرین ١٨/٢ لەسەر کرێکار و دووکاندارن. ٣٨/١ لە سەد خەریکی کارەکانی خەدەماتین سەرداپۆشراوی ٩٢ هێکتەرخان کراوە.

مەیدانی فوتباڵی شنۆ ٤٢٧٥٠، میترە کە ئێستاش هەر خاکی یە ، سالۆنێکی سەرداپۆشراوی چکۆڵەی واڵیباڵیشی هەیە .

بەپێی لێکوڵینەوە و راپۆرتی دەستەی ئەندازیارانی شارەداری پێوانەی شاری شنۆ لەسەریەک ٢٨٥/٩٢ هێکتارە ونفووسی شار ١٧٢٧٤ کەسە .

**وەرزیش وفەزای سەوزی شار**

شاری شنۆ جێگایەکی ناوی پارک نیە وبۆ ئەو مەبەستە جێگاش دیاری نەکراوە وتەنیا باخێکی کەشاوەرزی هەیە کە لەجیاتی فەزای سەوز دەیچنێ و ئەویش وردە وردە لە کەمی دەدا .. بۆ وەرزیشی دۆستان سالۆنێکی

**ئیدارەکانی شاری شنۆبریتین لە :**

بەخشداری، شەهرداری،پاسگاە سوپای پاسداران ،ئیدارەی ئاو،ئامووزیش وپەروەریش کەشاوەرزی ، ئیدارەی چەوەندەر، ئیدارەی بەرق ، پۆست وتێلگراف ، بانکی میللی، بانکی ئوستان شیرکەت تەعاوونی،دووخانیات بونیادی شەهید ، ئموری جەنگ زەدەگان ، کۆمیتەی ئیمدادی ئیمام، جەهاد سەبەن وئەحواڵ ، دارایی تەربیەت بەدەنی، دەفتەری عەشایری،بێهداری وهیلالی، ئەحمەر...

**داب ورەسمەکانی تایبەتی:**

١- قوربانی بۆباران : ئەگەر وەرزی بەهار باران نەبارێ نیشانەی وشکەسالی و قاتی وقڕی یە. خەڵکی ناوچە هەریەکە لە گوندی خۆی پێکەوە چەندسەر مەڕو مالات دەکەن بە قوربانی ونوێژەبارانە دەکەن. جا ئەگەر چەندرۆژ پاش ئەو رەسمە باران بباری ئەوان هەر لە نوێژە بارانە و قوربانی بارانەی دەزانن.

٢- سەرەخۆشی : لە گوندەکانی شنۆکاتێک کەسێک مردووی لێ دەمرێ هەر ماڵەی نەفەرێک لە مزگەوت دادەنیشێ و مەجمەی لە ماڵێ خۆیرا بۆ دەچێتە مزگەوت ئەوکارەی ئەوان نیشان دانی بەشداربوون لە غەمی بنەماڵەی مردووە و هەر وەها یارمەتی‌یەکەبۆ ئەوەی ساحێب مردوو زۆر تووشی خەرج وفشاری مالی نەبێ. بەشداری یان لە غەمی یەکتر بەچەشنێکە کە ئەگەر کابرایەکی ناشارەزا رێی لەمزگەوت بکەوێ پێی وایە مردووەکە هی هەموو خەلکە. دابی مەجمەبردن بۆمزگەوت ئێستاش لە دوو گەرەکی شنۆ (رەحیمزادەوحەنەفی )دا وەکوو پێشووە.

٣- ناشتنی مردوو بە دەفە:

زۆرکەس لە خەلکی شنۆ لە سەرەمەرگدا وەسیەت دەکا تەرمەکەی بە دەفە و زیکر بەرن بۆ ناشتن وەکوو شێخ ودەروێش و... جا بۆ ناشتنی ئەو مردووەهێندێک لە دەروێشەکان دەفەلێدەدەن وهێندێک کە پرچیان هەیە سەریان رووت‌دەکەن وناوی خودا وپێغەمبەر (د.خ) و.....

دێنن وبەو شێوەتاقەبرستان رەگەل مردووەکە دەکەون. جێژنەکانیش*** لەو ناوچە وەکوو هەموو ناوچەکانی دیکەی کوردستان بەڕێوە دەچن.

پاشماوەی ئەمباسە بریتین لە:

الف: عەشیرەکانی شاری شنۆ.

ب : زانایانی بەناو- بانگی شنۆ.

ج: شنۆ لەپێش میلادەوە تا ئێستا.

هیوا دارم بتوانم لە داهاتوویەکی نزیکدا رێک وپێکی بکەم و بینێرم تا ئەگەر بۆ بلاو بوونەوە بوو کەلکی لێ وەربگیرێ.

**سەرچاوە:**


**١- تحقیقات باستانشناسی ژاک . د. مورگان.**

**٢- جغرافیای استان آذربایجانغربی.**

**٣- شرفنامه شرف خان بدلیسی.**

**٤- مالک الممالکاصطخری**

**٥- لغت نامه علی اکبر دهخدا.**

**٦- گلدسته علما ،عرفا ادبا...قاضی محمدخضری.**

**٧- ژیناوەری زانایانی کورد.... محمد صالح ابراهیمی.**

**٨- عشائرالعراق حاج عباس غرادی.**

پیرێژنێک بوو ، دوو ددانـی مابوو ، پێیان دەکوت "دووددانیيە" ئەو پیرێژنە خەڵکی دێی لاچین بوو بەتەنیا لە خانوویەکی ژیکەڵـــە دەژیا . ئاواڵێکی هەبوو لەدێیەکی دیکە بوو . ناوی "یەک ددانــی یە" بوو . پیرێژنی یەک ددانـی یە زۆر سەهەندە بوو تــەمـای لــە ماڵـی دوو ددانی یە کردبوو لەوەختێـک دەگەڕا ماڵ ودارایی ئەوپیرێژنەی بستێنێ .

رۆژێک یەک ددانــی یــە هاتـــە لاچین وچووە ماڵی دوو ددانی یـە. پیرێژن دەستەخوشکەکەی زۆربەخێـر ـ هاتن کرد ودوو سێ رۆژ لـــەوێ بوو ولەپاشان بە زمانــی لــووس فریوی دا وبارگە وبنەی پێ تێک نا و بردیە ئاوایی یەکەی خـۆی پێی کوت :

"من تەنبا وئەتۆش بەتـــەنێـــی. واچاکە پێکەوە بین ، بەڵێ بــەو جۆرەپیرێژنی هێنا ماڵە خۆی ولە هەلێک دەگەڕا لەکۆڵ خۆی بکاتەوە.

یەک ددانی یە نانکەری مـــاڵـــی ئاغا بوو ، رۆژێک لەکن قەرەواش و کاردارەکانی ماڵی ئاغا کوتی:

ـ من کچێکی هێندە هێنــــــدە جوانم هەیە .

خەڵکی کوتیان : ئەگەر تۆ کچت هەیە بۆ چەند ساڵە ئێمەنەمـــان زانیوە....

پیرێژن کوتی :

ـ ئەمن لەئێوەم شاردۆتـــەوە ، ئاخر هیندە جوانە بەچاوە دەبـێ.

باس وخواسی کچی یەک ددانی یە گەیشتە گوێی کوڕی ئاغا . هانـــە

کن یەک ددانی یە وکوتی :
- تاریفی کچی تۆدەکەن یەک ددانی یە ئەدی بۆئیمە نەماندیوە.
- پیرێژنی زمانلووس کوتی :
- بەقوربانت بم کچی من هێندە جوانە بەچاوە دەبێ ،بۆیە دڵم نایە نیشانی کەسی بدەم.
بەڵام تۆ بتەوێ کارێکی وادەکەم بیبینی.
کوتی :
- کەنگی ؟
پیرێژن کوتی :
- سبەی ئێوارێ وەرە سەرکولانە و مەڕمەڕێکی تێ هاوێ وبڵێ ماڵێ

مەڕمەڕەکەم دەنەوە ،منیش مەڕمەڕەی دەدەم بەوی بتداتەوە.
پیرێژن هەستا چۆوە ماڵێ لە مەڕمەڕشای دەموچاوێکی دروست کرد لێوی بۆ سوور کرد، بە ڕەژی چاو و برۆی بۆ کێشاوە وبە سووراو
ڕوومەتی بۆ سوور کرد،دەستەواتێکی سپی لە مەڕمەڕشا بۆ درووی، دوو ددانی یەی ڕازاندەوە وجوانی کرد پیرێژنی دوو ددانی یە زۆر گێل و ساویلکە بوو. سبەی ئێواری کوڕی ئاغا لەسەربانی مێشێنی دەکرد

مەڕمەڕی لە کولانەی پیرێژنی یەک ددانی یەی هاویشت ،پیرێژنی یەک ددانی یە پیرێژنی دووددانی یەی ڕازاندبۆوە ومەڕمەڕی دایەوکوتی:
- بیدەوە دەستی . پیرێژنی دووددانی یەش مەڕمەڕی بۆهەڵێنا.
کوڕەش کەسەری بە کولانەدا گرتبوو، چونکوو نێومالێ کرمانجی تاریک وتنووک بوو، کە ئەو دیمەنەی دی پێی وابوو کیژێکی زۆر جوانە ولەتاوان دڵی لەخۆ بۆوە.
کوڕەیان بردەوە ماڵی وەهۆ- شیان هێناوە ،کوڕە ناردی یە

کن بابی و کوتی :

– کچی پیرێژنم بۆ بخوازن.

کوتی :

– ڕۆڵە کێهە کچی جوانی ئەو وڵاتەیە بۆت دەخوازم بەڵام کچی پیرێژن بۆ تۆ نابێ ئاخیری

رازی بوو ونارديیە کن پیرێژن و کچەی لێ خوازبێنی کرد.

پیرێژنی یەک ددانی یە دیسان پیرێژنی دوو ددانی یەی فریو دا، خوازبێنی هات نەیهێشت کەس بیبینێ ،جلیان بۆهێنا نەیهێشت کەس بیبینێ ،جوانی کرد وبووکی ساز کرد، حەوت شەوو ڕۆژ داوەت دەگەڕا، بووکیان گۆستەوە،تارا — یەکی ئەستووری پێ دادابوو،بووکیان لەسەر کورسی دانا ویستیان سەری هەڵدەنەوە نەیهێشت کوتی:

– تا زاوا نەیبینێ نابێ کەس بیبینێ .

زاوا تارای لەسەر بووکی هەڵداوە، تەماشای کرد پیرێژن وەک مەیموونی لەسەر کورسی دانیشتووە ، پیلی گرت و لە پەنجەرەی فڕێیدا، پیرێژن دەستی کرد بەگریان وبەخۆی هەڵدەگوت .

– پیرێژنێک بووم دەنکی هەنار هەڵیان داشتم شڵپە ودیار.

کوڕی پادشای جندووکان مووی لەدڵی هاڵبوو دەیان گێراشتێکی سەیر ببینێ وپێ بکەنێ و مووی دڵی بپسێ کە چاوی بەو دیمەنە کەوت هێندە پێکەنی مووی دڵی پسا وچاک بووە...

پیرێژنیان بردە کن پادشای جندووکان، پادشا کوتی :

– لەجیات ئەوچاکەی لەگەڵ منت کردووە هەرچی دەتەوێ داوا بکە، پیرێژنی دووددانی یەکوتی:

– دەمەوێ ئەوەندە جوان بم

بەمانگێ بلێم تۆ مەیە دەر من هەڵتووم وبێمە سەرحەدی چاردەسا ـ لەی وبمبەنە وەتاخی کوڕی ئاغا .

جندووکان پیرێژنیان جـــوان کرد وبردیانە وەتاخی کوڕی ئاغا

کوڕی ئاغا کەچاوی پـێ کـەوت کوتی :

ـ ئەوە ئەتۆ بۆواجوان بوویەوە.

کیژی جوانی تازەلاو (پیرێژنـی دووددانی یە) کوتی :

ئەمن هەروا جوان بووم ومنیان لەپێش چاوی تۆ رەش کردووە ،دەنا من هەروا بووم .

بەیانی هەرکەس لەدیوی بووکـێ دەهاتە دەر دەیکوت :

ـ بووک چەند جوانە پیرێژن هەقت بوو بەکەسی نیشان نەدەی.

لە دڵی خۆیدا کوتی :

ـ ئەمن مەیموونێکم بە بووک. دابوو دەبێ چ قەومابێ .

هەستا چووە ژوور، ئەگەر چوو چ بچێ کیژێکی جوانی وەک توولە نەمام لەسەر کورسی دانیشتووە .

بەدزی لێی پرسی :

"ئەوە بۆوات لێ هات .

کوتی :

ـ ئەگەر ئێوە رۆیشتن و بڵاوەتان کرد ئەمن کوتم واچاکە خۆم بکووژم ،هەستام مەنجەڵێک ئاوم وەسەر نا هەتا قش قش کوڵی،ئەوجار خۆم رووت کردەوە و خۆم تێ هاویشت ،کەچی نەمردم ولە جیاتیان ئاوا جوان بووم .

پیرێژن بەپەلە کاری ماڵی ئاغای کرد وچۆوە ماڵێ مەنجەـ ڵێکی ئاو وەسەرنا هەتا کوڵی لەپاشان خۆی تێ هاویشت . پیرێژن حەیاتی رەشی لێ برا .

(کاڵەم دڕا چم پێ نەبڕا)

# ئاژەڵ

ڕەسووڵ وەیسی

نەخۆشی مێرکوتە (آبلە) :

یەکێک لە نەخۆشی یەکانی ڤیرووسی ئاژەڵە کە لە هەموو مێیینەکانی (پستانداران) خۆماڵیدا جگە لە سەگ وپشیلە دەبیندرێ
هۆی نەخۆشی :

## هۆی نەخۆشی

ڤیرووسێکە لە دەستەی (پۆکس ڤیروسها) کە بە شێوەی چوارگۆشەیەکی تا رادەیەک دِرشتە کە:

ئ: لە بەرامبەر وشکایی دا بەهێزەو دەنێو دەڵەمەی وشک بووی ڤیرووسدا چەند مانگێک زیندوو دەمێنێتەوەو دەبێتە هۆی تەنەوەی نەخۆشی.

ب : لە بەرامبەرگەرمادا بێ هێزە، بە چەشنێک کە لە گەرمای زیاتر لە ۴۸ "پلە" لە ماوەیەکی کەمدا لەنێو دەچێ .

ج: لە جێگایەک دا کە هەوای تێدا نەبێ دەمەیێ و توند دەبێ (ڤیرووس) و توند وتیژی خۆی دەپارێزێ.

ڕێگای لێگرتنەوەی نەخۆشی:

## ڕێگای لێگرتنەوە

١- هۆی سەرەکی ڕێگای لێگرتنەوە دەزگای نەفەس کێشان ( کەپۆ - زاروگەرو) - وە.

٢- تۆزوخۆڵی تێکەڵاوبە ڤیرووس، تفاقی نێوکادێن و ئاخوڕیش تێکەڵاو دەکا و دەبێتەهۆی بڵاوبوونەوەی ئەم نەخۆشی یەواتە مێرکوتە.

٣- لەڕێگای برینداربوونی پێستیش لێی دەگیرێتەوە

**ئاژەڵی حەساس :**

لەکاتی ئاسایی داتەنیا مەڕ لە هەموو ئاژەڵێک حەساس ترە، لە حاڵێکدا کە کارمامز و کەروێشکیش حەساسیەتێکیان هەیە.

نیشانەکانی نەخۆشی :

## نیشانەکانی

لە مەڕان دا خاوەنی چەند خولە:

ئ : خولی هێرش کە وەزعی گشتی ئاژەڵ دەگۆڕێ و پلەی گەرمایی لەشی دەچێتە سەر کە ڕەنگە بگاتە ۴۱، تا ۴۲ "پلە" کەلەو کاتەدا ئاژەڵ کەمهێز و بێ ئیشتیا دەبێ.
ئەو خولە ۳ تا ۴ ڕۆژ دەخایەنێ و لەگەڵ هاتنە خواری نۆبەتیە نەخۆشی تارادەیەک کۆتایی دێ.

ب : خولی وەدەرکەوتنی ئاگرۆکە (جۆش) ئەوجێگایانەی کە موویان کەم پێوەیە وەکوو (بن هەنگڵ، مەمک گوان دێن و دەورو بەری چاو...) ئاگرۆکەیان لێ

وەدەردەکەوێ کە ٥% تا ١ سانتی مێتر پانایی یان هەیە زۆرجاریش ئاگرۆکە لە ژووورووی زاریش وەدی دێن.

ج: خولی زڵ زلاو (ترشح) کە زنچکاوێک لە ناو ئاگرۆکەدا دەر دەدا کە بەرە بەرە بەشێوەی بلۆقی نەرم دەردێن کە لە پاشان وشک ورەق دەبن. لەحالێکدا ئەگەر رادەی زنچکاویدەربوو زۆربەی بلۆقەکان دەترۆقێن و ئاوێکی سووری تاریک کەپاشان زەرد هەڵدەگەڕێ لە بلۆقەکان دێتەدەر کە لەسەر برینەکە دەڵەمە دەبەستێ، ئەو خولە ٣ تا ٥ رۆژە.

**خولی وشک بوونەوە:**

## خولی ویشک بوون

لەو خولەدا توێلکەکانی وشک بوو لەناو دەچن و جێگای ئاگرۆکەکان وەک قوڵکێکی بچووکی سپی دەمێنێتەوە کە خولی ئەو نەخۆشی یە بەقەرای مانگێکە وپاش ئەو ماوەیە نەخۆش چاک دەبێتەوە.

**سەرنج:**

**خولی نوستوویی (کمون):** نەخۆشی لەوەرزی زستان دا لە هاوین درێژخایەن ترە و بەشێوەی جۆراوجۆر دەبیندرێ.

١- (خفیف) کەم، سووک پێش هاتێکی گشتی و ڕوونی نیە بەڵام ئاگرۆکەی زۆر لەبن پێست وەدەردەکەون و پاش ماوەیەکی کورت سارێژ دەبن.

٢- نەخۆشی پڕ مەترسی (خطرناک): لە هێندێ کاتدا پێش هاتی نەخۆشی مێرکوتەی مەڕ بە رادەیەک توند وتیژە کە وەزعی گشتی ئاژەڵ لەرادەبەدەر دەگۆڕێ و بلۆقی سووری تاریک لە پێستەکەی دا وەدەردەکەون کە لەپاشان رەش هەڵدەگەڕێن بەم هۆیە ئەو چەشنە نەخۆشی یە مێرکوتەی رەش (آبلەسیاە) نێو دەبەن. لەو نەخۆشی یەدا کە دڵەکوتە و نۆبەتە هێرشێکی زۆر بۆ ئاژەڵ دێنێ. ئاژەڵ زوو لەناو دەچێ. لەکاتێک دا کە نەخۆشی یەکە توندتر بێ لە مەڕان دا دەبێتە هۆی لەبەرچوونی.

**ناسینی نەخۆشی:**

## ناسین

ناسینی نەخۆشی مێرکوتە لەمەڕان دا بەهۆی موعایەنە کردن لە ئاژەڵەکانی تر هاسانترە بەڵام نابێ ئەو نەخۆشی یە لەگەڵ ئەو نەخۆشیانە:

ئ: ئەوئاگرۆکانەی کە بەهۆی خواردنی گیای درکدار وەدی دێن.

ب: گۆڵە وتەبەق بە سەهوو بگرین.

**چارەکردن:**

چونکوو نەخۆش پێش تێپەڕکردنی خولی چەندجۆرە بۆخۆی چاک دەبێتەوە دەرمان کردنی پێویستی یەکی نیە، بەڵام لە هێندێ کاتدا کە رەنگە وەزعی گشتی ئاژەڵ شپرزەبێ. بۆ بەرگری لە چڵک وپیسایی لەدەرمانی دژی چڵک (آنتی بیۆتیک واتە ئەو دەرمانانە کە چڵک وپیسایی خاوێن دەکە- نەوە کەڵک وەردەگرین.

**بەرگری:**

## بەرگری

ع: واکسینەکردنی ئاژەڵ لە کاتی خۆیدا وساڵێ یەک یا دوو جار، بەتایبەتی ئەو مەڕانەی تەمەنیان لەساڵێک کەمترە وەکوو بەرخ.

ب: دروست کردنی جێگای

پاک وخاوێن وخاوێن کردنەوە ودەرمان رشاندنی جێگاکانی پێشووی ئاژەڵ بۆ لەناو بردنی ویرووس .

ج: جوێ کردنەوەی ئاژەڵی نەخۆش لە ئاژەڵی ساخ .

د: کاتی مایەکووبی و واکسینی مێرکوتەلەهەوەڵی مانگی رەزبەر تا ئاخری سەرماوەز بەڵکوو زۆرتریش درێژە دەخایەنێ. جا باشتر وایە مایەکوبی مێکوتە پێش وەرزی نیزیک کردنەوەی ئاژەڵ لە یەکتر (جفت گیری) بکرێ تاکوو نەبێتە هۆی نەخۆشی ئەو بێچووەی کە تازە لەدایکی دەبێ .

هـ : رادەی واکسینی مایەکووبی کراو ٥%ی سانتی مێترە کە لەبن هەنگڵ را لەبن پێستی ئاژەڵی ساخ دەردێ کە ساڵێ یەک یا دوو جار ئەوکارە دەکرێ و بەرخەکانی دوو یا سێ مانگەش دەتوانین مایەکوبی بکەین .

**هەمووگر ناسی :**

## هەمووگرناسی

لێگرتنەوەی نەخۆشی زۆرتر بەهۆی نێزیکی مەڕان لە یەکترە. رەنگە ویرووسی نەخۆشی لەناوخوری ، وپێستی مەڕی تێکەڵاویش دابێ وکارگەرانی کارخانە-کان لەو رێگەیەوە، دەیگرنەوە وبە هۆی نێزیکی لەگەڵ ئەمراز و خەڵکی دیکە ئەو تێکەڵاوی یە توندتردەبێ، بە چەشنێک کە ویروسی نەخۆشی لەگەڵ کەوتنە ناو جێگای مەڕەکان (هۆڵ) وا هەیە ماوەی ٥ تا ٦ مانگ زیندوو بمێنێ و لەکاتێکدا سەرلەنوێ نەخۆشی بڵاو بێتەوە.

**نەخۆشی رەشەبرین (شاربۆن)**

## رەشەبرین

یەکێک لە نەخۆشی یەکانی لێ گرتنەوە و هاوبەشی نێوان ئاژەڵ و ئینسانە کەهۆی نەخۆشی میکرۆبی یە. هاگ زایەو بەچەشنی میلەیەکی خرە کە (باسیلوس آنتواسیسی) پێ دەڵێن .

**نەخۆشی هەمووگر:**

## نەخۆشی....

ئەو نەخۆشی یە زۆرتر لەجێگای گەرم و زەوی ، ڕتووبەت و زناو بڵاو دەبێتەوە و زۆرتر لە رێگای دەزگای نەفەس کێشان ودەزگای هەزمی خواردەمەنی و پێستیش لە ئاژەڵ و ئینسان دا شوێن دادەنێ .

**هۆی کاریگەر لەپاگیربوونی ئاژەڵ وئینسان :**

## هۆی کاریگەر....

١- ئاو ٢- خواردەمەنی

٣- گیا (بەتایبەت گیای درک دار) کە دەبێتە هۆی بڕیندار بوونی مەعیدە وزارو گەروو کە هەل و مەرج بۆ ئەو نەخۆشی یە پێک دێنێ.

٤- کارخانەکانی کۆ-کردنەوەی خوری و پێست کە کرێکارەکانی بە هۆی تۆزوخۆڵی تێکەڵاو بەمیکرۆب لەرێگای زار و کەپۆ کە دەچێتە ناو سیپەلاک تووشی نەخۆشی رەشەبرین دەبن.

**ئاژەڵی حەساس بەنەخۆشی رەشەبرین :**

## ئاژەڵی حەساس

الف : گیاخۆران بە تایبەت (گا ، مەڕ ، بزن) حەساسیەتیان بەم نەخۆشی یە هەیە .

ب : یەک سمەکان ( تک سمی ها ) (ئەسپ ، ئێستر گوێدرێژ ) لەرەدەی دووهەم دان .

ج: وشتریش پاگیری ئەم نەخۆشی یە دەبێ .

باڵندەکان سەبارەت بەم نەخۆشی یەقایمترن و مەڕی

هێندێ لە وڵاتەکانی تر بە هۆی ڕەگەزیان لە بەرامبەر ئەو نەخۆشی یەدا بەهێزن.

**نیشانەکانی نەخۆشی :**

## نیشانەکانی....

خولی نووستوویی(کمون) کە نەخۆشی لەو خولەدا یەک یا دوو حەوتووە لە پاشان نوبەتێ دەست پێدەکا کە دەگاتە ٤١ تا ٤٢ پلە و جووڵانەوەی دەزگای نەفەس کێشان توندتر دەبێ. لە حاڵێکدا کەئەگەر نەخۆشی یەکە زۆر توند وتیژ بێ لەماوەی چەند سەعاتدا دەبێتە هۆی مردنی ئاژەڵەکە. بەشی جۆراوجۆری لەشی ئاژەڵ وەکوو (ئەوک ، دەوروبەری سک وگورچووەکان) ئەستووردەبن و ڕایەڵی ناو گۆشتی لەشی ئاژەڵ دەبرژێتەوە.لە مانگادا بێ ئیشتیایی و لەبەرچوون ڕوو دەدا ، هەر وەها مانگایەک کە شیر بدا شیرەکە وردە،وردە،کەم دەبێتەوە وئەگەر نەخۆشی یەکە توندوتیژ بێ پاش ٤٨ سەعات برست لە ئاژەڵ دەبڕێ و دەیکوژێ .

**قەڵاشتنی لەشی ئاژەڵ پاش مردن :**

## قەڵاشتنی لەشی....

پاش مردنی ئاژەڵ بەهۆی نەخۆشی ڕەشەبرین گۆشتی لەشی ئاژەڵ لەتورتی دەکەوێ وشل وول دەبێ و زۆر زوو با دەکاوئاوەکی- یەکی ڕوونی تێکەڵاو لەگەڵ خوێن لە ( زار و کۆم و زێی) ئاژەڵ دێتەخوار کە هەرکە هەوای لێدا دەمەیێ.

ئەگەر بێتوو بە نەخۆشی ڕەشەبرین دڵنیا بین نابێ لەشی ئاژەڵ لێک جیا بکەینەوە چونکوو لێک جیا کردنەوەی لەشی ئاژەڵ دەرفەت دەدا بە میکرۆب کە ببێتە ئیسپێر و ناوچەیەک دابگرێ و ببێتە هۆی نەخۆشی ئاژەڵەکانی تر.

**شوێنەواری قەڵاشتنی لەشی ئاژەڵ :**

## شوێنەواری...

١- بوونی خوێن ڕێژی لەتەواوی هەودای لەشی ئاژەڵ.

٢- بوونی خوێناوە لەنێو لەشی ئاژەڵ.

٣- گەورە وڕەق بووتی سپڵ .

٤- هەڵمسانی کیسەی سەفرا .

٥- ئەستووربوونی کەبەد

٦- پڕخوێنی ڕیخۆڵەکان.

**بەرگری:**

الف : لەبەرچاوگرتنی پاک وخاوێنی جێگای ئاژەڵەکان .

ب : سووتاندنی کەلاکی ئاژەڵ .

ج: دەچاڵ کردنی کەلاکی ئاژەڵ لەجێگای زۆر قووڵ و بۆ بەرگری کردن لە بڵاوبوونەوەی بۆگەنیو و میکرۆب قسڵاو بەکەلاکەکە دادەکەن.

د: خۆپاراستن لەدەست لێدانی خوری ،پێست وگۆشت و... .

هـ : لە هەمووی گرینگتر بەتایبەت لە بابەت مەڕان دا هەموو ساڵێ دەبێ لە وەرزی چوونە کوێستان دا واکسیناسیۆن واتە مایەکوبی بەڕێوە بچێ .

**چارە :**

## چارە

چونکوو دەرمانی نەخۆشی ڕەشەبرین ئاکامێکی باش بەدەستەوە نادا ، کەوابوو لە دەرمان کردن ( آنتی بیوتیک و...)خودەپارێزین .

٢- لەبابەت دەرمانی نەخۆشی ڕەشەبرین، ئینسان لە سرۆمی دژی ڕەشەبرین وآنتی بیۆتیک (پنی سیلین ) ئاکامێکی زۆرباش وەدەست دێنێ .

# پەندی پێشینیان

کێرک دەستکا خۆ نابڕە
(شوور کا لانێ خۆ نابڕە)
کودکا تژی ل یا قالا
مەدە.
دیاری یا شوانی هەلەکۆکە
مالێ قەلپ یێ خودانی یە
ئەگەر خولی یێ ل خۆ دکی
خولییەک گەرم.
دەوسا خەنجەرێ قەنج دبە،
لێ دەوسا خەبەرێ قەنج
نابە.
زاڤاهیڤانی،مریشک دۆتانی.
خودێ کەرناسی یە کو شاخ
نەدایێ.
ددانێ ژارا ل پەلووری دا
دشکێ.
ژن ومێرا شەڕ کرن، نە.
زانان باوەر کرن.
گەڕیان دەرمانە،قسمەت ل
سەر پێیانە.
حەتا داینێ داڤ بسۆژە
دایکێ دل دسۆژە.
دەرێ مزگەڤتێ یە، نەتێ
هەلکۆلان
نەتێ فرۆتان،نەتێ گرێدان.
هەم دزە، هەم دادبەرزە
بەق نەقورە، زک ددرە.
دەستێ تەنێ روویێ مرۆڤ
رەش دکە.
دەستێ شکەستی،بارە بۆ
ئوستی.
مریشکێ هێک کری،خوەرا
هەڤالەک چێ کری.

سەی سوور وسپی فەرقی نیە
چاکە هەر خراپەیە
پێ لەقەدەر بەرەی خۆت
ڕاکێشە.
تەگبیر و تەغدیر لێک
جودان.
تەغدیر تەگبیران بەتاڵ
دەکا
مردوو ئەگەر مرد لاقی درێژ
دەبێ.
ئەگەر ماڵ چوو ئیمانیش
دەچێ.
گورگ ئەگەر لە بارانەی
ترسابا کەپەنکی بۆخۆی
ساز دەکرد.

دەستی بەپەلە لەباتی ماسی
بۆقی دەگرێ.

کراسێکی بدرە بە پیسی
هەزاران بدرە بە پاکی
هەر بەدوای پیسەکەیدا
دەرۆن
کوێر چی دەوێ دوو چاوی
ساخ.
هەرچی هەقە تاڵ و رەقە.
هەتا جێ سینگ نەکەیەوە
دای مەکوتە.
تفی رۆکراو هەڵناگیرێتەوە
گیا بەجێی سەختەوە دەمێنێ
وویەت لەنێوان دوو زانا
ناپسێ.
زۆرگوتن قوڕئان خۆشە.

# مەتەڵ

لەزگی دایکی دێتەدەر
پشتی بابی دەخورێنی

«مەمکە»

دایک پۆڵایین
باوک بەردی خار
بێچوویان دەبێ
وەک دەنکی هەنار

«[illegible]»

سواری کەپۆیە
دوو گوێی بەگرۆیە
چاوی دەتۆیە

«[illegible]»

هەتا بیبڕی پان دەبێ
هەتا هەلیقەنی قووڵ دەبێ

«[illegible]»

دەچمە سەر تەپکێکی
لاقم دەکەوێتە قولکێکی

«[illegible]»

منداڵ :

خات بەسێ مقەستم دەیە
بۆ دایکم .

ژن :

بۆ کورم بۆخۆتان
مقەستتان نیە ؟

منداڵ :

با هەمانە ! بەلام
مقدستی ئێمە ئاسنی ناکا
و خرا دەبێ .

خەیاتێک دەستێک جلکی
تازە بەکابرایەک دەفرۆشی
کە پارچەی ئەسڵ نابێ
و تێک دەچێ !
کابرا جلکەکە لەبەر دەکا
و دەچێتە دەر بارانی
بەسەردا دەبارێ و وا تێک
دەچێ لەبەریدا دەبێتە
کیفەکێشک !

زۆر توورە دەبێ. خۆ
دەگەیەنێتەوە لای خەیات .
خەیات کە دەزانێ شەپکە
توندە بەرەوپیری دەچێ و
دەڵێ :

— ماشەڵڵا ! هەزار
ماشەڵڵا لە دۆینێوە چەند
درێژ بووی !

دوو کەس وێکرا قسەیان
دەکرد یەکیان کوتی :

— بابم دەیکوت بابی
بابی خۆی دیتووە !

— جا ئەوە چیە بابی
من دەیکوت بابی بابی بابی
بابی بابی خۆم دیوە !

— ماڵت خرا نەبێ
حەتمەن بابت شێت بوو
دەنا چۆن شتی وا دەڵێ ؟

— ناوەڵڵا شێت نەبوو
تۆزێک زمانی دەگیرا .

— نامەکەت پێگەیی ؟

— کێهە نامە؟ ئەوی
نووسیبووت هەزار تمەنەکەت
بۆ بنێرمەوە ؟

— راست بۆخۆیەتی !

— نە بەسەری تۆئێستا
پێم نەگەیشتووە !

زارا : ئەرێ ئامین کچەکەت
چۆنە ؟

ئامین : جا چۆن بێ.وەڵڵا
بەکەیفی تۆیە. مێردێکی
باشی وەگیر کەوتووە.بەختە
— وەر بووە و حەساوەتەوە
مێردەکەی رۆژ هەتا ئێوارە
ئەوە قۆڵی هەڵماڵیوە ،و
کاری لەجیات دەکا .

زارا :

— ئەدی کورەکەت ؟

ئامین :

— دایکێ بەخودای
چارەرەش بووە ! ژنێکی
هێناوە. وەی! وەی! وەی! ئەو
کورە ناسک ونازدارەم شەو
و رۆژ قۆڵی هەڵماڵیوە و
کاری لەجیات دەکا !

# قەتاغەکان

ئەحمەد – ڕەوشت

شاعیری ئاوارەی عیراقی

هەوا ساردە لوتکەلەبێشەی خەمەوە
چاو لەبرینی پڕسۆم دەکا .
لەنێو دڵم پرووشەی بەفر دەبارێ
کوێستانانم لێ سپی دەکا .
لەبەر چاوم هەرچی کەفرو لێڕەوارە .
دەسووتێت ودووکەڵ دەکا .
ئەمئێوارە خۆرەتاوم گەلێ زووتر ئاوادەبێ.
ئەستێرەکان دەر دەکەون
مانگەشەوی پایزی خەم وەدی دێنن
لوورەی گورگی کێوەکانیش .
دەگەڵ دەنگی باڵندەی شەو
تێکەل دەبێ وخەم بەئاسمانان وەردەبێ.
ئەم ئێوارە دونیا زووتر تاریک دادێ
خەم لەزاسی کوڵێ دەروون هەڵدەڕژێنن
هەرچی ژان وهەوروتەمە
لەئاسمانی بیرەوەریم دادەبارێ.
ئەستێرەکانم ون دەبن
تارماییەکان بەرچاو دەگرن
ئاسۆی دوورم تاریک دادێ
ئەم ئێوارە دڵم هەمووی تاشەبەردە
ناهەموارە ، کەندوو کولۆی شێوو وەردە .
برینەکانم هەمووی پڕسۆن.
هەرچەند دەکەم ژانەکانم دانامرکێن
پەڵەهەورێ بەری ئاسۆی لێ تارکردووم .
خۆرەتاوو مانگەشەوی لێ ونکردووم
ژینم هەمووی ڕەنج وئاخ وزامی سەردە
ئەمئێوارەئەستێرەکان پڕشنگ نادەن
مانگی تازە لێم ون دەبێ.
لەتارمایی تاریکەشەودەمێنمەوە .
لەپەنجەرەی نیوەتاکی ژوورەکەمدا
بەرە وئاسۆی دوور دەڕوانم .
وەدی ناکەم ترووسکەیەک لەڕێگەی ژین
ئەم ئێوارە خەمی دەروون دەدۆزمەوە
کێلگەکانی کوان وبرین دەکەمەوە
درزەکانی نێو ئێسقانم دەکرێنەوە

گیانم دەبێتە شەتی خوێن
بۆ بەهاری ئارەزووی ژین
کوڵێ دەروون بەهیوای دڵ دەبڕێنمەوە .
ئەم ئێوارە بەئاواتی شادی ژیان.
لەدەروازەی خەیاڵاتم ژوور دەکەوم
هەرچی ئاونزای ساردە وەلادەنێم
دەنێو دۆڵی کپ داماوی ڕەگەکانم
بۆ بڕانەوەی زانی دەردوبرینەکانم
زۆر بەئاواتچادری شادیم بەرز کەمەوە

تێبینی : لەپڕ کردنەوەی ئەم جەدوەلەدا هەموو ئوسوولی ڕێنووسی کوردی بەپێی ڕێنووسی هەڵبژێردراوی ئەم گۆوارە ڕەچاو کراوە جگە لەوەی نیشانەی (٧) دانەنراوە واتا ئەگەر بۆ وێنە وشەی ( شڕ، کوڵ، زۆر، شێر ) ی تێدا بێ بە شکڵی ( شر، کول، زور، شیر و... ) دەنووسرێ

١-بەیتێکی فۆلکلۆری کوردی یە وباسی سەردەمداری حوکماتی بابانەکان لە سلێمانی دەکا. ٢- عەرزو عەردی ڕاست - پیتێکی دوو پاتە- بەمشێوە- دۆستی تانەولەگەڵی نەبێ کر هەڵدەوەشێ ٣- ڕۆژهەلاتناسی بەناوبانگی ڕووسی کە کتێبی "مەموزینی خانی بە ڕووسی وەرگێڕاوەتەوە- خۆشەویستی وحەزلێ کردن ٤- چوارپێی کەس نەناس- نووکودوعا-واژە وکەلیمە- لک وشاخە ٥- دنە- لکی دارەمێو- قارەمانێکی بەیتی مەموزین ٦- هۆنراوەوریزکراو- پێشگری فیعلی موزاریغ - تێروجەواڵ ٧- شێوەڕۆیشتن - ناوچەیەکی بەناوبانگی بانە ٨- ئاشکرا نیە- هەراو- ئێستا نەبووە بە هەور ٩- ئەویش زەمان پێشان دەدا - کاولە لەحسای "سوارۆ" لەم وڵاتەیە ١٠- ئی گورگ بەناوبانگە- گوڵێکی بۆن خۆش و مل کەچ ١١- شارودەریاچەیەکی کوردستانی تورکیا - کەلێک لەنێوان سەقز وبانە-١٢-پێتەختی میسر- تەشەروتانووت ١٣- نیشانەی نەبوون - تەگبیرورا وێژ- هیچی لە دڵدا نیە ١٤- زۆری نەماوە رام بێ - گوندی ماموستاهێمن - دۆست ١٥ - نیشتمان - کاس وگێژ - سپی و چەرمگ.

١- مەستوورەی کوردستانی شاعیرەی گورد بەمناوەش ناسراوە- عەشیرەتێکە ٢- هەر نشێوێک هەیەتی - هەم ئاژەڵێکە وهەم بەمانای جاروبارە- مووی گەردنی ئەسپ ٣- تێبین ولەسەرەخۆ- چەپەڵ وشووم- باقۆ- ٤- ئاواتی کۆسەدڵ ودەروون - کەرەسە ٥- واش هەر شێوەیە- نەققاشی کوردی ٦- نەقڵ وچیرۆک- شینی سەربڕاو- یەکێک لە چوار دەروازەی قەڵای وان لە کتێبی ئەولیاچەلەبی دا- ٧- بەرماوی هەنگوینی قاڵ - وەرزی شاعیری قەدیم ٨- قسە بزرکاندنی نەخۆش- ژمارەیەکە ٩- شارێکی هەورامان - گراوی دیقل - ساردی شیمال ١٠- بەداس دروێنە دەکا- نیشانەی پەلە- هەڵدێ بەڵام لاقی نیە ١١- وەکوو- ئی زڕدایک چووکە ١٢- قیسی شاری سنە- وچانەی کارمەند ١٣- دەستەکەی ڕەد مەکەوە - لەقەبی حەزرەتی ئیبراهیم ( د.خ ) ١٤- بەشێکی چاو- هاوار- بەرماوی سوور- ١٥- بۆی هەولێر- لێڵ نیە- زێدی شێخ عوبەیدوڵڵای شەمزینان.

لەنێو ئەو کەسانەیدا کەپڕکراوەی ئەم ژمارەی سرووەمان بۆبنێرن، یەک کەس بەپێی پشک بەبەرەندە دەناسرێ. بەمەرجێک ئەمخالانەی خوارەوە لەبەرچاو بگرێ:

١- جەدوەلەکە بەخەتێکی خۆش بنووسرێ وا بێ پیتەکان بێنەخوێندنەوە.

٢- ئەسڵی جەدوەلەکەمان بۆبنێرێ لەکاغەزی دیکەدا بەشداری نادرێ.

٣- لانی زۆر پازدە ڕۆژ پاش دەرچوونی گۆوارەکە پڕکراوەی جەدوەلەکەی ناردبێ.

٤- پڕکراوەی جەدوەلەکە هەڵەی تێدا نەبێ

جایزەی پڕکردنەوەی جەدوەل سالێک ئابوونمانی گۆواری سرووەیە.

مەدەست ئاڤیتی کیژ* گولێ گول چلمسین*
ئەز چوومە بەرئاڤێ چەما چەم مرچقین*
ئەز بوومە یارگەل کی یارێ ژمن ڕەڤین
من گۆتە کێ دوستۆیارێ، دژمن هەژین

*　　*　　*

بەختێ منی ڕەش ڕەشترە ژ پەڕێ قرێ
دل کون کونە کەزەب* حەموو کول وگرێ
من گۆتە کێ جانێ گولێ دل هۆگرێ
ئاخ گۆتە من کۆلێ برۆ، کۆلێ برێ

*　　*　　*

پێ پال ڕەشم، ڕەش وەها ئەز نازکری
ڕەشا تییێ دا ژییێ خوەمە دەربازکری
نازنازۆکا دژمە هەقاسی ناز کری
مەرگ ومرنێ هەردەما ئەز گاز کری

*　　*　　*

ل گشت تەمەن قەت من گولەک بیێن نەکری
قەت سۆرگولا ناڤا دلا شیێن نەکری
دلێ برین قەت خۆشییەک زیێن نەکری
کیژان یارێ دلی هەژار پیێن نەکری؟

*　　*　　*

ئەز دێ چ کەم بڤێ ژینێ گەل برینێ
سەرهاتییا من بوو سەرهاتا مەموزینێ
جێ خۆشییا هەردەم دکەم ژارۆ شینێ
نەڤینی بێ زۆر پەس کری وارێ ڤینێ

*　　*　　*

ب ڤان دەردێ ناڤا دلێ خوەیی کولدار
دەبێ کو ئەز دژ ئالۆزیا بکەم هاوار
هەستم سەرپێ درستانێ بکەم گولزار
وان کانییا ب خەباتێ بکەم رووبار

*　　*　　*

وان سۆرگولا ناڤا دلا بگەشینم
گولاڤا وان سەر تەفەشێ بوەشینم
کۆشکێ حەموو نەڤینییی بهەرشینم
خو بۆلایێ هیڤیداری یێ بهەژینم

**پەرویز جیهانی**

# فەرهەنگۆک

**گۆڕەپان:** مەیدان، دەشت و پانایی، گۆڕەپانی شەڕ مەیدانی شەڕ.
**بەرفرە:** زۆر و ڕەوەند، هەراو.
**بەرفرەوان:** پێش ئاواڵە پان و بەرین.
**نەترە:** ورە، زەندەق.
**نەترەبەر:** ورەبەر. زراو، تۆقێن. ترسناک.
**ترۆپک:** ئەوپەڕی بڵێندایی وەک ترۆپکی دار، ترۆپکی شاخ. قوللە، دوند، ئەوج.
**ملهوڕ:** زۆردار. ستەمکار چەوسێنەر.
**کۆیلەتی:** عەبدایەتی عەبد. ژێردەستی، بەردەیی.
**تۆژینەوە:** لێکۆڵینەوە.
**ئاشێرەکردن:** ئیشارە کردن. نیشاندان.
**پێ چڕ:** (پێچڕ): گیان سەخت و قایم.
**بنەگر:** جێ گرتوو، کەسێک لە جێ یەک بمێنێتەوە. (مستقر).
**ڕاهات:** عادەت.
**بەهیچ کلۆجێ:** بە هیچ بارێکدا. بەهیچ شێوەیەک (بە هیچ کل ووجە).
**سواڵەت:** سفال، کلێنە.
**بەبێ سی ودوولێکردن:** بێ ماتڵ بوون، بێ درەنگ.
**گەلەخەندە:** کۆرێک، جەماوەرێک کەبۆ موناسەبەت کۆ بوونەوە.
**گێرەی لەهەولێر دەگەڕێ:** ئاگای لەخۆ نیە، فکری لە جێگەیەکی دیکەیە.
**وەج:** بایەخ.
**بەوەج:** بایەخدار.
**پێوانە:** ئەندازە، مەساحەت
**مەڕمەر:** بەردێکی سپی وسان
**بەرهەم:** ئاکام، نەتیجە.
**ناقۆلا:** نالەبار، شپرزە.
**ڕواڵەت بازی:** زاهیرسازی فریودان.
**کوڕی ڕۆژ:** هەلپەرست، کەسێک کەتەنیا قازانجی خۆی دەوێ (ابن الوقت)
**بەرژەوەند:** مەسڵەحەت. سوود و سەلاح. تێبینی.
**بەرجەوەند:** دوور نوما. دیمەنی دوورە چاو.
**شۆنە:** زەوی ئاو نەگر.
**شەوگەڕ:** لاوی سەوداسەر کە بە شەو دەگەڕێ.
**شەوگورد:** ژوانی شەو.
**ـدسرم:** فێنکایی.
**کیژ:** کێهە.
**چلمسین:** ژاکان، سیس بوون.
**مرچقین:** وشک بوون. هەڵچۆران.
**کەزەب:** جەرگ.
**هەروسان:** هەروەها.
**پاقش:** خاوێن، پاک (پاکیزە)..
**هەگەر:** هۆ، سەبەب.
**کەفر:** کەڤر: بەرد، کوچک.
**قەتماغ:** قرتماغە، قەیماغە بەستنی برین.
**مەلاس بوون:** خۆ حاشاردان.
**خۆمەلاس دان:** خۆ حاشاردان.
**نەرەخساوە:** ـەلواوە.
**ئاتاج:** موحتاج، نیازمەند.

ئەم واژەگەلە لە ناوەرۆکی گۆواردا بە ئەستێرە (*) دیاری کراون.

ناوچەی ئالان :دیاری مستەفا پوورمەند

تەبیعەت : دیاری کەریم رەسووڵی .

تەبیعەت : دیاری خالید قەلعەکووهی .

ماڵی عیزازولمولکی سنە : دیاری سەلاح یووسفی

سەوەچنین دیاری سەلاح عەرەبی